میخائیل شۆلۆخۆف



# چارەنووسی ئادەمیزاد

دوکتۆر
ئەورەحمانی حاجی مارف
لە ڕووسیەوە کردوویە بە کوردی

محەمەدی مەلاکریم
پێیدا چوەتەوە

میخائیل شۆلۆخۆف

# چارەنووسی ئادەمیزاد

دوکتۆر
ئەورەحمانی حاجی مارف
لە ڕووسی‌یەوە کردوویە بە کوردی

محەمەدی مەلاکریم
پێیدا چوەتەوە

چاپخانەی ..الحوادث..
بەغدا - ١٩٨٠

ميخائيل شولوخوف

مصير انسان

human's fate

ترجمه عن اللغة الروسية
الى اللغة الكردية

الدكتور عبدالرحمن معروف

راجعه

محمد الملا عبدالكريم

ئێمە خاوەنی ئەم بەرهەمە نین ٠ بەشی ئێمە هەر ئەوەندەیە هەوڵمانداوە کارێك بکەین خوێندەواری کورد بتوانێ لە ڕێگای ئەم ڕازەوە ئاگاداری چارەنووسی مرۆیەك ببێ کە لەپێناوی بەختەوەریی ئادەمیزاددا ئەو گشتە مەینەتەی هاتوەتەڕێ ٠٠

بۆیە بە مافی خۆمانی دەزانین بەری ڕەنجەکەمان پێشکەش بە هەموو ئەوانە بکەین کە بەختەوەریی خۆیان لە خەباتا بۆ دوایی پێهێنانی کلۆلیی بەرەی ئادەمیزاد بەدیدەکەن ٠



له دۆنی سه‌روو ، یه‌که‌م به‌هاری دوای شه‌ڕ به‌هارێکی ته‌واوو له کاتی خۆدا ـ گه‌یشتوو بوو • له کۆتاییی مانگی مارتدا بای گه‌رم له (پریزۆفی)یه‌وه ده‌ستی به هه‌ڵکردن کرد• له ماوه‌ی دوو شه‌وو دوو ڕۆژدا به‌فری به‌ری چه‌پی دۆن یه‌ك پارچه توایه‌وه‌و لم ده‌رکه‌وت • به‌فری زۆری ده‌شتو شیوو دۆڵ که‌وته توانه‌وه • سه‌هۆڵ درزی تێبوو • جۆگه‌و ڕووباری ده‌شته‌کان که‌وتنه هاژه هـاژ • ڕێـگاو بانه‌کان زوربه‌یان بڕان •

لەم کاتە بێ ڕێگاو بانەدا ، دەبوو بچم بۆ وێستگەی ( بووکانۆفسك ) • بەرلەوەی خۆر هەڵبێ لەگەڵ هاوڕێکەم کەوتینەڕێ • هەرچەندە ڕێگاکەش ئەوەندە دوور نەبوو ــ هەمووی هەر شەست کیلۆمەترێك دەبوو ــ ، بڕینیشی هێندە ئاسان نەبوو • جووتێ ئەسپی تێر ، زۆر بە زەحمەت عەرەبانەکەیان پێ ڕادەکێشرا • پێچکەی عەرەبانەکە تا نیوەی لە قوڕو چڵپاوی بەفرو سەهۆڵدا نقوم بووبوو • پاش سەعاتێك لەسەر پشتو بن زینی ئەسپەکان ، لەژێر قایشی تەنکی ئەملاو ئەولایاندا کەفی وەك پەموو سپی پەیدا بوو • لە شنەی شەماڵی خاوێنی بەرەبەیاندا بۆنی ئارەقەی ئەسپەکان دەهاتو تنۆکی گەرمەوەبوو لالغاوەیانی چەور دەکرد •

لەوشوێنانەدا کە بەتایبەتی بۆ ئەسپەکان زەحمەت بوو ، ئێمە لە عەرەبانەکە دادەبەزینو بە پێ دەڕۆیشتین • بەفری نەرم بوەوە لەژێر پوستاڵەکانماندا خرمەی دەهات • ڕۆیشتن زەحمەت بوو ، بەڵام لە لاڕێکاندا سەهۆڵ هێشتا توند بوو و لەبەر تیشکی هەتاو بریقەی دەهات • تێپەڕین بێرەدا زەحمەتر بوو • دوای شەش سەعاتێك تەنیا سی کیلۆمەترمان بڕیبوو و گەیشتبووینە ئەو شوێنەی دەبوو لەوێدا لە ڕووباری ( ئیلانکا ) بپەڕینەوە •

ئیلانکا ڕووبارێکی بچووکە ، هاوینان لە هەندێ شوێندا وشك دەکا • لەوکاتەدا بەرانبەر گوندی (مۆخۆفسك) ، لە شوێنێکی زەلکاوی پڕ درەختدا نزیکەی بە پانایی کیلۆمەترێك ئاوی ڕووبارەکە بلاوبووبوەوە • دەبوو بە بەلەمێکی بن پان بپەڕینەوە

ئەوبەر کە لە سێ کەس زیاتری نەدەگرت • ئەسپەکانمان لەمبەرەوە بەجێهێشت • لەوبەرەوە لە عەمباری کەڵخۆزێکدا ئۆتۆمۆبیلە کۆنێکی دنیادیدە کە هێشتا زستان بوو لەوێ بەجێمان‌هێشتبوو ، چاوەڕوانیی دەکردین • بە دووقۆڵی لەگەڵ شۆفێری ئۆتۆمۆبیلەکە سواری ئەو بەلەمە خەتەرە بووین • هاوڕێکەم لەگەڵ شت‌ومەکەکانمان لەمبەر ڕووبارەکە مایەوە • هەر کە لە قەراخی ئاوەکە ترازاین ، لە بنە ڕزیوە کون‌کونەکەی بەلەمەکەوە ئاو قوڵەقوڵ وەك فوارە هاتە ناوەوە • چی لە بەردەستدا بوو خێرا ئاخنیمانە کونەکانی ئەو تەشتە بێکەڵکەوە ، بەڵام تا گەیشتینە جێ هەر خەریکی ئاو دەردان بووین • پاش سەعاتێك گەیشتینە ئەوبەری ئیلانکا • شۆفێرەکە ئۆتۆمۆبیلەکەی لە گوندەکەوە هێنا • چووە لای بەلەمەکەوەو دەستی دایە سەوڵەکانی‌و گوتی :

ـ ئەگەر ئەم بەلەمە ڕزیوە لە ئاوەکەدا لەت‌وپەت نەبێ ، ئەوە پاش دوو سەعاتێك دێینەوە • بەر لەوەندە چاوەڕوان مەبە •

گوندەکە بە پانایی کەناری ڕووبارەکەدا کشابوو • لەسەر ڕۆخی کەنارەکەش بێدەنگی‌یەکی ئەوتۆ بوو کە تەنیا لە کۆتاییی پایزو سەرەتای بەهاردا لە شوێنی چۆڵو کەس تێدا نەبوودا هەیە • لە ئاوەکەوە هەوایەکی تەڕی شێدار دەهات • بۆنی توندو تیژی درەختی ڕزیو پیاوی کاس دەکرد • بەڵام لە دەشتە دوورەکانەوە کە لە تەم‌و مژدا نقوم بووبوون شەماڵێکی نەرمی هەمیشە بەهاری

دەهێنا کە بە هەزار حاڵ بۆنی خۆشی زەویی تـازە لەژێـر بەفـر ئازادبووی دەگەیاندە برناخمان •

لە نزیك لمی قەراخ ئاوەکەوە پەرژینێکی کەوتووی لێ بوو ، لەسەری دانیشتم • ئارەزووی جگەرە کێشانم کرد • دەستم کرد بە گیرفانی لای ڕاستی کورتەکە لبادەکەمداە بەڵام، بەوپەڕی داخەوە، دیتم پاکەتەکەم هەمووی تەڕ بووە • کە لـە بەلەمـەکەدا بوویـن شەپۆلێکی گەورەی هێناو ئاو بەسەر دیواری نزمی بەلەمەکەدا هاتـە ناوەوە • ئاوی قوڕاوی تا ناوقەدم هات • لەودەمەدا من کاتی ئەوەم نەبوو بیر لە جگەرەکانم بکەمەوە • دەبوو سەوڵەکە دانێمو خـێرا خێرا ئاو دەردەم بۆئەوەی بەلەمەکە نقوم نەبێ • کەچی ئێستا داخ بۆ کەمتەرخەمیی خۆم دەخۆم • پاکەتەکەم بە هێواشی لە گیرفانـم دەرهێنا • لەسەر چیچکان دانیشتمو جگەرەکانم یەکە یەکە لەسەر پەرژینەکە هەڵخست •

دەمەو نیوەڕۆ بوو ، خۆر ، وەك لە مانگی مایسدا ، تیشـکی گەرم بوو ، بەهیوا بووم جگەرەکانم زوو وشك ببنەوە • پەشیمان بووم کە ئەو جلە ئەستوورەم لەبەرکردبوو • لەڕاستیدا ئەمە یەکەم ڕۆژی گەرمی دوای زستان بوو • دانیشتن لەسەر پەرژینەکە ، وا بە تەنیاو بەو بێدەنگی‌یە قووڵە ، زۆر خۆش بوو • کلێتە کۆنـە ئەستوورەکەم لەسەرم داگرتو قژە تـەڕە ئارەقاوی‌یـەکەم کـە لەئەنجامی ئەو هەموو سەوڵ لێدانەوە ئارەقەی کردبوو تەڕ بووبوو،

هەناسەیەکی دا • بێ بیر کردنەوە دەمڕوانییە قەتارەی پەڵە هەوری ڕەش •

زۆری پێنەچوو دیم لە خانووەکانی سەرووی دێوە پیاوێک بە شەقامەکەدا دەڕوات ، دەستی کوڕێکی بچووکی گرتووە بە باڵایدا دیارە پێنج شەش ساڵانە زیاتر نا • کابراو کوڕەکە ماندووانە هەنگاویان هەڵدەهێنایەوە • دەیانویست بپەڕنەوە ، بەڵام ڕووی ڕێیان بەرەو لای من گۆڕی • پیاوێکی باڵابەرزی پشت کۆم نزیک بوەوەو بە دەنگێکی گڕی نووساو گوتی :

ـ براله ، ڕۆژباش !

ـ ڕۆژباش !

دەستە گەورە چرچەکەشیم کە بۆی درێژ کردبووم ، گوشی • پیاوە لای کردەوە بە لای کوڕەکەداو گوتی :

ـ ڕۆڵە ! مەرحەبا لە لالەت بکە • ئەویش وەك من شۆفێرە • تەنیا ئەوەندە هەیە منو تۆ سواری لۆری بووبووین ، بەڵام ئەو ، ئەو ئۆتۆمۆبیلە بچووکە دەهاژوێ •

کوڕە ، ڕووناك وەك ئاسمانێکی بێ گەرد ، ڕێك چاوی بڕی‌یە چاوەکانمو بە کەمێ زەردەخەنەوە ، ئازایانە دەستە بچکۆلە ساردو سڕە سوور هەڵگەڕاوەکەی بۆ درێژ کردم • منیش سووکێك دەستیم ڕاوەشاندو لێم‌پرسی :

ـ پیرەمێرد ! ئەوە چی‌یە ، بۆچی وا دەستت ساردە ؟ خۆ دنیا گەرمی کردووە ، کەچی تۆ سەرماتە •

کوڕە بە هەستێکی ناسكو بڕوایەکی منداڵانەوە باوەشی بە ڕانمدا کردو بە سەرسامی‌یەکەوە برۆ سپی‌کارەکانی هەڵبڕی :

ـ خاڵە ! من کەی پیرەمێردم ؟ من هێشتا منداڵمو هیچ سەرماشم نی‌یە • دەستەکانیشم کە ساردن ، لەبەرئەوەیە یاریم بە بەفر کردووە •

باوکە ، توورەکەکەی کە هەندێ شتومەکی تێدابوو لە کۆڵی خۆی داگرتو ، بە بێ‌هێزی‌یەکەوە لە تەنیشتم دانیشتو گوتی :

ـ نەگبەت خۆم لەگەڵ ئەم ڕێبوارەدا • بەهۆی ئەوەوە بنی پێم سوا • کە هەنگاوی گەورە هەڵدێنێتەوە ، دەبێ ئەو بکەوێتە نەرمە ڕەوت • جا ئیتر وەرەو بەپێی ئەو بڕۆ • لەوشوێنەی من پێویستە یەك هەنگاوی بۆ هەڵبهێنمەوە ، دەبێ سێ هەنگاوی بۆ بنێم • بەمجۆرە وا نارێكو ناقۆلا ڕێ‌دەکەین ، وەك ئەسپو کیسەڵ • زیاد لەوە دەشبێ هەردەم چاوێکت لێی بێو ئاگاداری بیت • هەر تۆزێك ڕوو وەرچەرخێنێ ، کاتێکت زانی چووەتە ناو جۆگەلەیەکەوە یان پارچە سەهۆڵێکی بەدەستەوەیە وەك نوقوڵ دەیمژێ • نەوەڵلا ئەمە کاری پیاو نی‌یە لەگەڵ ئەم چەشنە ڕێبوارانەدا بە دنیای بەریندا بگەڕێ • کابرا کەمێك بێ‌دەنگ بوو • جا پرسیی :

ـ براله ! ئەی تۆ چی دەکەی ؟ دیارە چاوەڕوانی سەرۆکەکەتی •

بەلامەوە جوان نەبوو لە خەیاڵی بدەمو پێیبڵێم من شۆفێر نیم • بۆیە لە وەڵامدا گوتم :

ـ چار چییە دەبێ چاوەڕوانیی بکەم •

ـ بەڵێ •

ـ نازانی بەلەمەکە زوو دەگاتە ئێرە ؟

ـ پاش دوو سەعاتێك •

ـ کەم نییە • قەیناکا • جارێ دەحەسێینەوە • پەلەم چییە ؟ لەمنزیکەوە دەڕوێشتم ، تەماشام کرد برای شۆفێرم خۆی لەبەر هەتاو هەڵخستووە • بیرم کردەوە ، گوتم دەچم جگەرەیەکی لەگەڵ دەکێشم • چ جگەرەکێشان بێو چ مردن بەتەنیا تاڵیو مەینەتە • دیارە دەوڵەمەندی بۆیە ئەو جۆرە جگەرانە دەکێشی • قەدریشیان نازانی بۆیەت تەڕکردوون • ئای برا ، چ‌تووتنی تەڕو چ ئەسپی بەرەڵلا بەکەڵکی هیچ نایەن • باشترە وەرە زەلە توندو تیژەکەی من بکێشین •

دەستیبرد دەستەسرێکی سووری پڕتووکاوی گرمۆڵەکراوی ئاوریشمی لە گیرفانی پانتۆڵە خاکییە هاوینییەکەی دەرهێنا • کە کردییەوە فریای خوێندنەوەی ئەوە کەوتم کە لەسووچێکیدا بە چنین لێی نووسرابوو : « بۆ جەنگاوەری خۆشەویست ـ لە قوتابییانی

کچی پۆلی شەشەمی قوتابخانەی ناوەندیی لێبیدیانەوە » •

توندو تیژترین جگەرەی دەستپێچمان کێشاو ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بووین • من ویستم لێی بپرسم لەگەڵ ئەو منداڵە بۆ کوێ دەچێو چ پێویستێك ئەو ڕێگایەی وەبەر ناوە ؟ بەلاّم ئەو لە پرسیاردا پێشم کەوت :

ـ بۆچی ئەوە تۆ سەرانسەری جەنگ هەر لەسەر سوکان بووی ؟

ـ نزیکەی سەرانسەری ••

ـ لە مەیدانی شەڕدا ؟

ـ بەڵێ •

ـ ئای براله ! منیش تا لە لووتمەوە سەری کرد لەو تاڵیو مەینەتەم نۆشی •

دەستە بۆرە گەورەکانی لەسەر ئەژنۆی داناو نووشتایەوە • لەلاوە تەماشایەکم کرد • تێکچووم • بینیوتانە کە چاو پڕ دەبێ لە خۆڵەمیش وای لێدێ هەڵنایەو ماتەمیی مەرگی لێ دەنیشێ • چەند گرانە بنیادەم بەو چاوە تەماشای شت بکا • چاوی ئەو تازە بە ڕێکەوت ناسیاوەم ئا بەوجۆرە بوو •

چیلکەیەکی خواری وشکی لەو کۆمەڵە چیلکەی لەتەنیشتیەوە بوو ـ هەڵگرتو لە تاوێکی بێدەنگیدا بە خۆڵەکەی بەردەمیدا هێناو

هەندێ وێنەی مانابەخشی کێشا ، جا کەوتەوە قسە :

ـ جاری‌وا هەیە شەو ناخەوی ، تەماشای تاریکایی دەکەی‌و بیردەکەیتەوە : « ژیان ! تۆ لەبەرچی منت وا شەل‌و ئیفلیج کردووە؟ لەبەرچی وا دەستت ناوەتە بینەقاقەم ؟ من نە لە تاریکی‌و نە لەبەر خۆری پرشنگدارا ڕووناکی شك نابەم •• نەخەیر چاوەڕوانیم پێ ناکرێ» • لەپڕ باوەشی بە کوڕەکەدا کرد • دوایی پاڵێکی هێواشی پێوەناو پێی‌گوت : بەرخۆلەکەم ! بڕۆ ئەو گوێ ئاوە ، بۆ خۆت یاری بکە • منالّ هەمیشە لای ئاوی گەورەوە نێچیرێکی دەسگیر دەبێ • هەر ئاگادار بە قاچت تەڕ نەکەی •

لەوکاتەدا کە ئێمە بێ‌دەنگ جگەرەمان دەکێشا، من بە لاچاوێك سەیرێکی باوك‌و کوڕەم کرد • شتێك سەرنجی ڕاکێشام • ئەویش ئەوەبوو کە کوڕە جل‌وبەرگێکی عادەتیی لەبەردابوو ، بەڵام باش‌بوو • چاکەتە درێژە چاکەکەی باش لەبەری چەسپ بوو • پۆتینە خنجیلانەکانی بە جۆرێك بۆ دروست‌کرابوو ئەوەی تێدا ڕەچاو کرابوو گۆرەویی خوریی لەگەڵ لە پێ بکات• دروونەوەیەکی ئێجگار وەستایانە لەسەر شوێنە دڕاوەکەی قۆڵی چاکەتەکەی بوو • ئەمانە هەموو ئەرکی بەتەنگەوە هاتنی ئافرەتیان پێوە دیار بوو ، دەست‌زێڕینیی دایکیان تێدا بەدی‌دەکرا • بەڵام باوکە بە چەشنێکی‌تر سەرنجی ڕادەکێشا : کورتەکە ناودارەکەی هێندە کون‌و سووتاویی پێوە بوو ، لە زۆر شوێنەوە لۆکە سەری دەرهێنابوو• ئەو شوێنانەشی

کە دوورابوونەوە تەقەڵی نارێکیان لێدرابوو • ئەو پینەیەی لە ئەژنوێ پانتۆڵە خاکی یەکەی درابوو ، باش نەدوورابوەوە • تەقەڵە گەورەکانی لە کاری پیاوی ناشارەزا دەچوون • جووتێ پۆستاڵی نوێی سەربازیی لەپێدا بوو ، تۆرەوی یە خوری یە ئەستوورەکەشی مۆرانە خواردبووی و دەستی ئافرەتی نەگەیشتبوویە • لەوکاتەدا من بیرم بۆ ئەوە دەچوو : یان بێوە پیاوە ، یان نێوانی لەگەڵ ژنەکەی خراپە •

کابرا بە چاو کوڕەی ڕەوانە کرد • جا کۆکەیەکی کپی بۆ کردو سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە قسە • منیش ئازای ئەندامم هەموو بۆی بوو بە گوێ •

ـ ژیانم لە سەرەتادا ژیانێکی عادەتی بوو • خۆم لە شارستانی ( ڤەرۆنیژ ) لەدایك بووم • لە ساڵی هەزارو نووسەدەوە هاتوومەتە دنیاوە • لە شەڕی خۆماڵیدا لە تیپی ( کیکفیدزا )ی سوپای سووردا سەرباز بووم • لە قاتو قڕی یەکەی ساڵی بیستودوودا ناردیانم بۆ ( کووبان ) بۆ بەگژاچوونی دەرەبەگەکانی ئەو ناوچەیە • ئەمە بوو بووە هۆی مانەوەم لە ژیاندا • بەڵام باوکم و دایکم و خوشکە بچکۆلەکەم لەماڵەوە لەبرسانا مردن • من بەتەنیا مامەوە • خزم و کەس و کار ، هەموو سەرزەمین بگەڕێی لە هیچ جێیەك تاکە کەسێك چی یە شکی نابەم • پاش ساڵێك کە لە کووبان گەڕامەوە ، خانووە قوڕەکەم فرۆشت و چووم بۆ ڤەرۆنیژ • لە سەرەتادا لە کۆمەڵی

هەرەوەزیی دارتاشاندا دەستم‌کرد بە کار • دوایی چوومە کارگەو فێری ئاسنگەری بووم • زۆری پێ‌نەچوو ژنیشم هێنا • ژنەکەم لە هەتیوخانە گەورە بووبوو، بێ‌کەس‌وکار • کچێکی چاك بوو بووە هاوسەرم • هێمن‌و ڕووخۆش‌و زیرەك • لێم سەرو زیاد بوو • هەر لە منداڵی‌یەوە دەیزانی هۆقەی کلۆلی بە چەندە ، بەڵکو ڕەنگە هەر ئەمەش بووبێت لە هەڵس‌و کەوتیدا ڕەنگی دابێتەوە• لە دوورەوە تەماشات‌کردایە ، هێندە سەرنجی ڕانەدەکێشای • بەڵام خۆ من لە دوورەوە تەماشام نەدەکرد • لە نزیکەوە تێم دەڕوانی‌و چاوو گیانم هەموو لەگەڵیدا بوو • بەلای منەوە شۆخی‌وا لە جیهاندا نەبووەو نابێتەوە •

ماندوو مردوو لە ئیش دەگەڕێیەوە • جاری‌وایش هەیە وەك شەیتان تووڕەی • کەچی لە وەڵامدا وشەیەکی ڕەق، چی‌یە بەدەمیدا نایەت • لەسەرخۆو ناسك‌و دەم بە زەردەخەنە ، لە شوێنی نەرم‌و نیان داتدەنێ • لەگەڵ ئەو نەبوونی‌یەشدا خواردنێکی خۆشت دێنێتە پێش • تەماشای دەکەی دڵت ئاو دەخواتەوە • دوای تاوێك باوەشی پیا دەکەی‌و پێی‌دەڵێی : « گیانەکەم ، ئیرینا ! ببوورە کە قسەی نابەجێم بێ گوتی • بڵێم چی• لەسەر ئیش دەمەقاڵەیەکم بوو بە تووشەوە » • دیسانەوە ئاشتی لەنێوانماندا پرشنگ دەداتەوەو منیش دڵم ڕەحەت دەبێ • براله ! تۆ دەزانی ئەمە بۆ ئیش چەند کاریگەرە؟ سبەینان ئازا لە خەو هەڵدەستم ، دەچمە کارگەو هەموو کارێك بەگەرمی ڕادەبەڕێنم • ئەمەیە ئەنجامی ئەوە کە پیاو ژن‌و هاوسەری باش‌و بەوێلی ببێ •

جاری‌وایش بووە مانگانەم وەرگرتووەو لەگەڵ هەندێ دۆست‌و برادەر بووم هەموویم داوە بە خواردنەوە • وایش ڕێ کەوتووە بە سەرخۆشی‌یەکی ئەوتۆوە گەڕاومەتەوە بۆ ماڵ لام لە موو کردوەتەوەو چرووچاوم غــەزەبی لێ باریــوە • قاچــم تێــکەڵ‌و پێــکەڵ بوون‌و شەقــامەکانم بەلاوە تەسك بووە • خۆ تەنگیی کۆڵانەکان ئەوە هەر باسی مەکە • ئەو دەمە لاوێکی تێکسمڕاوو بەخۆوەو بەهێز بووم • هێندەی شەیتانێکم دەخواردەوەو هەمیشەیش بەپێی خۆم دەچوومەوە بۆ ماڵ • هەرچەندە ناوە ناوە وایش ڕێدەکەوت کە نزیــك مــاڵ دەبوومەوە پەکم دەکەوت‌و ئیتر بە گاگۆلکێ لەسەر هەر چوار پەل دەڕۆیشتم ، بەلام هەرچۆن بێ خۆم دەگەیاندەوە ماڵێ • دیســان دەنگێك، هەرایەك، قیژەیەك، بۆڵەیەك چی‌یە لێی نابیستی • ئیرینای من تەنیا پێدەکەنێ، ئەویش بە نەزاکەت، بۆئەوەی من بە سەرخۆشی دڵــم نەیەشــێت • جلەکانــم دەکــۆڕێ‌و بەگوێمــدا دەچــرپێنێ : « ئەندرووشا ! لای دیوارەکەوە ڕاکشێ ، ئەگینا بەدەم خەوەوە لەسەر قەرەوێڵەکە تل‌دەبیتەوەو دەکەویتە خوارێ » • بەلام مــن وەك ڕەشکەکا دەکەومو چاوم ڕێشکەو پێشکە دەکات • تەنیا گوێم لەوەیە کە بە نەرمی دەست بە سەرمدا دێنێ‌و بە چرپە وشەی پــڕ هەست‌و سۆز بەرانبەرم دەردەبڕێ •

بەیانی دوو سەعاتێك بــەر لە کاتــی کار خەبــەرم دەکاتــەوە بۆئەوەی بێمەوە سەر خۆم • دەزانێ دوای ئەو ســەرخۆشی‌یــەی دوێنێ هیچم بۆ ناخورێ • بۆیە خەیاری ناو ترشیات یان هــەر

شتێکی‌تری سووکو بەتامم بۆ ئامادە دەکاتو پەرداخێکیش قۆدکام دەداتێو دەڵێ : « ئەندرووشا ! ئەوە هەڵدە ، با بێتەوە سەر خۆت ، بەڵام گیانەکەم جۆرێکی‌تر هێندە مەخۆرەوە » • پەرداخە قۆدکاکە دەخۆمەوەو بێدەنگ بە چاو سوپاسی دەکەمو ماچی دەکەمو بەگورجی دەکەومەڕێ بۆ سەر ئیش • توخوا قەت دەشێ ئەو چاکی‌یە لەبیر بکرێ ؟ بزانە قسەیەکی ناشیرین ، بۆڵەیەکی لە ڕوومدا کرد ؟ منیش وەك خوا دەمپەرست • کوا ژنەی هاوژینم ؟ لەم سەردەمەدا کەیبانوویوا کەی دەستدەکەوێ ؟

هێندەی نەخایاند منداڵمان بوو • لە سەرەتادا کوڕێکمان بوو ، پاش ساڵێکیش دوو کچ • لەودەمەوە لە برادەران دوورکەوتمەوە • هەموو مانگانەکەم بۆ ماڵەوە دەهێنایەوە • ژمارەی کەسانی خێزانەکەمان پتر بوو • ئیتر خواردنەوەی تێدا نەدەبوو • ڕۆژانی پشوو پەرداخێك بیرەم دەخواردەوەو لەوێدا نوختەیەکم دادەناو دەمبڕی‌یەوە •

لە ساڵی بیستو نۆدا ئارەزووم چووە سەر ئۆتۆمۆبیل لێخوڕینو فێری بووم • بوومە شۆفێری لۆریو لەپشت سوکانەوە دانیشتم • بەم ئیشەم وا ڕاهاتم ئیتر ئارەزووم لە گەڕانەوە بۆ کارگە نەما • شۆفێریم بەلاوە خۆشتر بوو • بەمچەشنە دە ساڵم بەسەربرد بێ‌ئەوەی هەست بکەم چۆن بەسەرچوو • وەك خەوێك وابوو • بەڵێ دە ساڵ چی‌یە ؟ لە هەر پیاوێکی پیر بپرسی ئەو چۆن هەست

بە بردنەسەری ژیانی دەگا ، ئەوە بزانە هەستی بە هیچ نەکردووە •
ڕابوردوو وەك دەشتێکی کاکی بەکاکیی‌یە لە تەم‌و مژدا • سبەینان
بەو دەشتەدا کە دەڕۆیشتم هەر چوار دەوری ڕوون‌و ساف ، بیست
کیلۆمەترێکم دەبڕی ، ئیتر تەم‌ومژ هەموو دەشتی دادەپۆشی، وای لێ
دەهات گیاو دارستان ، کێڵگەو شارای گەنم لێك جوێ نەکرێنەوە •

ئەو دە ساڵە شـەوو ڕۆژ کارم دەکرد • دەسـتکەوتی باشـم
هەبوو • لە خەڵکی‌تر خراپتر نەدەژیاین • منداڵەکانیش بەختەوەر
بـوون • هەرسێـکیان لـە قوتابخانە یـەکەم بوون • گەورەکەیان
( ئەنەتۆلی ) لە ژمارەدا هێنـدە زیرەك بـوو ، تەنـانەت ڕۆژنامەی
ناوەندی دەربارەی نووسی • لەکوێوە ئەو تواناو بەهرە گەورەیەی
ژمارە زانینی بۆ هاتبوو ؟ براله ! من خۆشم نازانم • تەنیا ئـەوە
دەزانم کە من بەوە زۆر شادمان بووم‌و شانـازیم پێـوە دەکرد ••
ئێجگار زۆر شانازیم بە هەموویانەوە دەکرد •

لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا کەمێك پارەمـان پاشەکەوت کـرد •
بەرلەوەی شەڕ دەست‌پێ‌بکا دوو ژوورو هەیوانێك‌و گەنجینەیەکمان
دروست‌کرد • ئیرینا دوو بزنی کڕی • ئیـتر چیی‌ترمـان دەوێ ؟
منداڵەکان شیربرنجیان بۆ بوو بیخۆن • خانوویەکمان هەیە داڵدەمان
بدا • پۆشتەین • بێ‌خاوس نین • هەموو شتێکمان ڕێکوپێکە • تەنیـا
منم بە ساڵدا چووم • لە نزیك کارگەی فڕۆکەوە شەش‌سـەد مەتـر
زەوی‌یان دامێ • لانەم ، دەبوو بچێتە ئەو شوێنە خۆشە • لەوانەبوو
ژیان بە جۆرێکی‌دی بەسەرچوایە •

بەڵام لەناکاو شەڕ هاتو یەخەی گرتین• بۆ ڕۆژی دووەمی لە سەربازخانەوە بانگیان کردم • لە ڕۆژی سێیەمیشدا لەگەڵ کاروانی جەنگاوەران ڕەوانەی مەیدان کرام • هەر چوار کەسەکەم ـ ئیرینای ژنمو ئەنەتۆلیی کوڕمو ناستینکەو ئۆلووشکەی کچم ـ ماڵاوایی‌یان لێ کردمو بەڕێ‌یان‌خستم • منداڵەکان هەموو باش خۆیان ڕاگرتبوو ، هەرچەند کچەکان پاشان تۆزێ گریانو هەندێ فرمێسکیان ڕشت • ئەنەتۆلی تەنیا شانی هەڵدەتەکاند ، وەك سەرمای بێ • لەو سەردەمەدا پێی نابوە حەڤدە ساڵی‌یەوە• ئەی ئیریناکەم ؟ لە سەرپاکی حەڤدە ساڵی هاوسەریماندا وا نازدار نەمدیبوو • ئەو شەوە تا بەیانی شانو سەرسنگی کراسەکەم لەبەر فرمێسکی ئەو وشك نەدەبووەوە•• بەیانیش هەر هەمان گریان • لەگەڵم هاتنە وێستگەی شەمەندەفەر• ئەوەندەم بەزەیی پێدا دەهاتەوە ، نەمدەتوانی تەماشای بکەم • لێوەکانی لەبەر فرمێسك هەڵئاوسابوون • پرچی لەژێر ڕەفتەکەیەوە هاتبووەدەرێ • چاوەکانی بەجۆرێك لێڵ بووبوون وەك ڕەنگی گێژی‌یان تێ‌کرابێ •• قوماندانەکان فەرمانی سواربوونیان دا • ئیرینا خۆی دا بەسەر سنگمدا • دەستەکانی لە ملم گیر کرد • وەك درەختی شکاوە دەلەرزی •• منداڵەکان بەسەریا دەهاتنو منیش دڵم دەدایەوە ، بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو • ژنەکانی‌تر لەگەڵ مێردو منداڵەکانیان قسەیان دەکرد ، بەڵام ئەمەی من وا خۆی پێمەوە نووساندبوو ، وەك گەڵا بە دارەوەو هەر دەشلەرزی • زمانیشی گۆی نەدەکرد وشەیەکی پێ دەربڕێ • پێم‌گوت :

« گیانەکەم ، ئیرینا ! وەرە بەرمەدە • وەرەوە سەر خۆت ! هیچ نەبێ وشەیەکم بۆ خواحافیزی پێ بلێ » • وەك کەسێکی لاڵ هاتە دەنگ • بۆ دەربڕینی هەر وشەیەك تفێکی قووتدەدا :
« ئەندرووشا ! گشت کەسەکەم •• جارێکی‌تر •• لەم جیهانەدا••
من‌و تۆ •• یەکتر نابینینەوە •• » •

من خۆم لەبەر بەزەیی پێدا هاتنەوەی ئەو دڵم شەقار شەقار بووبوو • کەچی ئەویش بەو وشانە ماڵئاوایی لێ دەکردم • دەبوو لەوە بگات کە بۆ منیش ئاسان نەبوو لێیان جوێ‌ببمەوە • خۆ من بۆ ماڵی خەسووم نەدەچووم بۆ گیپە خواردن •• تووڕەیی هێرشی بۆ هێنام • دەستیم لە ملم کردەوەو نەرمێ پاڵێکم پێوە نا • پاڵەکەم نەرم پێوە نا ، بەڵام هێزەکەی من دڕندانە بوو • خەریك بوو بیخات بەپشتدا • دیسانەوە بە چەند کورتە هەنگاوێك بەرەو لام هاتەوەو باوەشی پێدا کردمەوە • منیش نەڕاندم بەسەریاو پێم‌گوت : « ماڵاوایی وا دەکرێ ؟ تۆ بۆ بەرلەوەی وادەی مەرگم هاتبێ ، وا بە زیندوویی دەمنێژی ؟ » باوەشم پێدا کردەوە ، دیم هیچ ئاگای لە خۆی نی‌یە •

لە ناوەڕاستی وشەیەکدا چیرۆکەکەی پچڕاند • کە بێ‌دەنگی باڵی بەسەرماندا کێشا ، ئەوسا من گوێم لێ بوو قوڵپی گریانە لە گەروویدا تاساوە • شەپۆلی کزی‌و ماتەمینیی خەڵك منیشی گرتەوە• بە لایەکی چاو ڕوانیمە سەرگوزەشتە گێڕەوەکە ، بەڵام یەك

تنۆك فرمێسك چی‌یە ، بە چاوە مردووە کوژاوەکەیەوەم بەدی نەکرد • پەژارەیەکی قووڵ گرتبوویەوە • سەری پتر شۆڕ کردبووەوە • دەستەکانی بەردابوونەوە ، دەلەرزین • چەناکەی‌و لێوە تورتەکانیشی دەلەرزین •

بە هێواشی پێم‌گوت : برادەر ! پێویست ناکات • لە بیر خۆتی بەرەوە • دیارە ئەو گوێی لە وشەکانی من نەبوو • چ ئیرادەیەکی مەزن بوو ، لەپڕ بزواندی‌و بە دەنگێکی ئێجگار سەیرو گڕەوە کەوتەوە دوان‌و گوتی :

ـ تا ڕۆژی مردن ، تا دوا سەعاتی ژیان لە خۆم نابوورم کە ئەو کاتە ئەو پاڵەم پێوە نا •

سەرلەنوێ‌و بۆ ماوەیەکی درێژ بێ‌دەنگ بووەوە • ویستی جگەرەیەك بپێچێتەوە ، بەڵام کاغەزی ڕۆژنامە دڕاووو تووتن بەسەر ئەژنۆیدا بڵاوبووەوە • سەرەنجام هەرچۆن بوو جگەرەیەکی خوارو خێچی پێچایەوەو چەند مژێکی توندی لێ دا • کۆکەیەکی بۆ کردو تێ‌هەڵچووەوە •

ـ دەستم لە ئیرینا بەردا • هەردوو لەپی دەستم لەسەر ڕوومەتەکانی دانا • ماچم‌کرد • لێوەکانی وەك سەهۆڵ وابوون • ماڵئاواییم لە منداڵەکان کرد • ڕام‌کرد بۆ لای واگۆنەکەم • باش بوو فریا کەوتم خۆم هەڵدەمە ناوی • شەمەندەفەرەکە ورد ورد کەوتە گەڕ • تەماشا دەکەم منداڵەکانم وا بێ‌باوك دەکەون •

دەستیان بۆ هەڵتەکاندم • دەیانویست پێبکەنن ، بەلام پێکەنین خۆی شاردبوەوە • ئیرینا دەستی لەسەر سنگی دانابوو • لێوەکانی وەك گەچ سپی هەڵگەڕابوون • لەبەرخۆیەوە وڕێنەی دەکرد • تەماشای دەکردمو چاوی نەدەتروکاند • چەمابووەوە بۆ پێشەوە، وەك بی‌یەوێ بەرانبەر بە ڕەشەبا هەنگاو بنێ • لە سەرانسەری ژیانمدا بەمشێوەیە لە یادمدا جێگیر بووە : دەست لەسەر سنگ ، لێوی سپی هەڵگەڕاو ، چاوی زەق ، فرمێسکی گەورە گەورە •• بە زۆری لە خەویشدا هەر بەو شێوەیە دەیبینم •• بۆچی ئەوکانە ئەو پاڵەم پێوە نا ؟ تاکو ئێستا هەرچەند دێتەوە یادم دەڵێی بە چەقۆی کول دڵم لەتلەت دەکەن •

لە ئۆکراینا دابەشیان کردین • ئۆتۆمۆبیلێکی زیلیان دامێ • پێی چووم بۆ مەیدانی شەڕ • چیت دەربارەی شەڕ بۆ بگێڕمەوە • خۆت بینیوتەو دەزانیت • لە سەرەتادا چۆن بوو ؟ زوو زوو نامەم لە ماڵو منداڵەکەمەوە پێ دەگەیشت ، بەلام من کەم نامەم بۆ دەناردن • وام بۆ ڕێدەکەوت • بۆم دەنووسین بەری هێرشمان گرتووە • هەموو شت تەواوو ڕێکوپێکە • وردە وردە شەڕ دەکەین • هەرچەندە ئێستا دەکشێینەوە دواوە ، بەلام بەمزوانە هێزی خۆمان کۆدەکەینەوەو ئەوسا دەرزێکیان دادەدەین • لەوە زیاتر چیم بنووسیایە ؟ کاتێکی زۆر خەمگین بوو • فریای نووسین نەدەکەوتین • ددان بەوەشدا دەنێم کە من خۆم ئارەزووم لێ نەبوو بەستەی کڕووزانەوە بڵێمو ، قینیشم لەو کەسە لیکنانە دەبوەوە کە

هەموو ڕۆژ بە موناسەبەو بێ موناسەبە نامەیان بۆ ژنو خۆشەویستەکانیان دەنووسی‌و کاغەزەکەیان بە چڵم سوامە دەدا : « بارم گرانە • لە نەخۆشی‌و مەینەتیدام • هەر ئەوەندەت زانی کوشتمیان » • ئەوەتە سەگی پانتۆڵ لە پێ • گلەیی لە حاڵی خۆی دەکا • دەیەوێ خەڵك بەزەیی‌یان پیایدا بێتەوە • ئەی لێکنی چڵمن بۆ بیر لەوە ناکەیتەوە کە ژیانی ژن‌و منداڵە نەگبەتەکانمان لە ژیانی ئێمە خۆشتر نی‌یە • هەموو هیوای دەوڵەت ئەو ژن‌و منداڵانە بوون • دەبوو ئەو ژن‌و منداڵانەی ئێمە چ شان‌و باهوویەکیان هەبێ تا لەژێر باری ئەو قورسایی‌یەدا نەنووشتێتەوە ؟ ئەوەبوو نەنووشتایەوەو ڕاست ڕاوەستان • کەچی هەندێ کەسی سووك‌و ترسنۆك نامەی کڕووزانەوەیان دەنووسی •• ژنانی زەحمەتکێش مەردانە هاریکاری‌یان دەکرد ، بەڵام پاش وەرگرتنی ئەوجۆرە نامانە ، بەسەزمانانە ، دەستیان شل‌دەبوو کاریان پێ نەدەکرا • نەخەیر ! ئەگەر تۆ پیاوی ، ئەگەر سەربازی ، دەبێ بوردەباریی هەموو شتت هەبێ‌و ئارام بی ، بەتایبەتی کە ناچاری ئەو بارەی داوی بەسەردا • بەڵام ئەگەر تۆ هەوێنی مێیت لە هیی نێری پتر تێدایە ، ئەوە هیچ نەبێ بۆئەوەی لەدواوە لە ژن بچی تەنوورەیەك لەبەرکەو دۆشەکڵەیەکی لە بندا دانێ تا سمتە سیسەکەت پیان دیار بێ‌و ، بڕۆ مانگا بدۆشە • بەوجۆرە لە مەیدانی شەڕدا پێویستیان پێت نابێ • لەوێ بێ تۆ جەنگاوەر زۆرە •

فریا نەکەوتم ساڵێك شەڕ بکەم • لەو ماوەیەدا دوو جار

بریندار کرام ، بەڵام هەردوو جارەکە برینداری‌یـەکەم ســووك بوو • جارێکیان لەپێ دەستمو جارەکەی‌تریـش قـاچم بریـندار کرا • جاری یەکەم گوللەم لـە فڕۆکەیەکەوە بـۆ هاتو جاری دووەمیش پارچە بۆمبایـەکم بەرکەوت • سەربازێـکی ئـەڵەمان ئۆتۆمۆبیلەکەمی لە سەرەوەو لە لاوە سمی • بەڵێ براله ، بەختی ڕەشم هەر لە هەنگاوی یەکەمەوە هێنای •• هێنای •• هێنای تـا بیناقاقەم • لە خوار ( ڵۆزۆڤێنك )ەوە بە دیل گیرام • ئەمە لە مایسی ساڵی چل‌ودوودا بوو • لەوبارە پڕ شەرمەزاری‌یەدا بـووم هێرشی دڕندانەی ئەڵەمانەکان بۆپێشەوە دەچوو • وا ڕێ‌کەوت یەکێك لە تۆپە سەدو بیست‌و دوو میلیمەترەکانی ئێمە خەریك‌بوو گوللە تۆپی لێ ببڕێت ، لۆری‌یەکەی منمان تا سەر شێلمانەکانی لە گوللە تۆپ بارکرد • خۆشم لە بارکردنەکـەدا هێنـدەم کار کـرد باڵەکانـم شل‌بوون • دەبوو ئێجـگار پەلە بـکەم ، چونـکە شـەڕ نزیـك دەبوەوە لێمان • لە لای چەپەوە نـاڵەی تانك‌و ، لە لای ڕاستەوە گوللە باران بوو • لە پشتیشـەوە زرمـەی مەترەلـۆز دەهـات‌و بۆچڕووك دەکەوتە بەر لووت •

قوماندانەکەمان لێی‌پرسیم : « دەڵێی چی ؟ پێیدا تێدەپەڕی؟»• پرسیاری نەدەویست • لەولا لەوانەیە هەڤاڵەکانم بکوژرێن • منیش لێرە دەستەو ئەژنۆ دانیشم ؟ وەڵامم دایەوە : «قسەی پێ ناوێ• دەبێ پێیدا تێپەڕمو بڕایەوە» • گوتی : « کەواتە تف کە لە شەیتان » • پێم پیا نـا • بـەدرێژاییی ژیـانم هەرگـیز وەك ئەوجـارەم لـێ

نەخوڕیبوو • دەمزانی پەتاتەم بار نەکردوەو بارەکەم پێویستی بە لێخوڕینێکی هێمن و لەسەرخۆیە ، بەلام کام هێمنی و کام لەسەرخۆیی لەکاتێکدا برادەرەکانم بە دەستی بەتاڵ شەڕدەکەن ، یان کاتێ چوار دەور ئاگرو گوللەباران بێ • شەش کیلۆمەترێک ڕۆیشتم و پێچم کردەوە بۆ ئەو ڕێگا تەنگەی بۆ شیوەکە دەچوو کە بەتالیۆنەکەی خۆمانی لێ بوو • لەوێ بینیم - ئای دایکە گیان !- سەربازی پیادە لە ڕاست و چەپەوە لەمسەر تا ئەوسەر خۆیان داوە بە زەویداو سەنگەریان گرتووە • ئەبێ من چی بکەم ؟ بۆ دواوە ناتوانم بگەڕێمەوە • لە هەموو لاوە تەنگم پێ هەڵچنراوە • نزیکی کیلۆمەترێکی مابوو تا بەتالیۆنەکەمان • تازە کار لە کار ترازابوو • براله ! وا هاتە پێشێ نەگەمە هەڤاڵەکانم • وا پێدەچێ لە دوورەوە بۆمبایەکیان هاویشتبێتە بەردەمی ئۆتۆمۆبیلەکەم • هیچ گرمەیەکم گوێ لێ نەبوو ، تەنیا ئەوەندەم هەستکرد شتێک لەناو سەرمدا تەقیبێتەوەو لەوە بەولاوە هیچم لەبیر نییە • چۆن لەو ڕووداوەدا مام ؟ نازانم ! هەروەها لەبیرم نییەو سەری لێ دەرناکەم ماوەی چەند بە مردوویی کەوتبووم • کە هۆشم هاتەوە بەر خۆم ، نەمتوانی هەستمە سەرپێ • سەرم بە ملمەوە شل بووبوو و بەلادا دەکەوت • هەموو ئازای ئەندامم دەلەرزی • وەک تووشی ڕشانەوە بووبم وابوو • بەرچاوم تاریک ، شانی چەپم خڕەی دەهات • گشت گیانم لەبەر ئازار دەیزریکاند • لەوە دەچوو دوو ڕۆژ لەسەر یەک جنرابێ • ماوەیەکی زۆر بە سکەخشێ بەسەر زەویدا کشام •

دوایی هەرچۆنێ بوو هەڵستامە سەر پێ ، بەڵام دیسان هەر هیچم لێ حاڵی نەدەبوو لەکوێمو چی ڕووی‌داوە لێم . بیرم بە یەکجاری بڕا . دەترسام سەرلەنوێ پاڵ بکەومەوە . نەمدەوێرا ڕابکشێمەوە . جارێکی‌دی ڕاست نابمەوە . دەمرم . لەسەر پێ ڕاوەستام . ڕەت‌دەدەم . وەك نەمامی بەر گێژەڵووکە بەم‌لاو بەولادا دەکەوم .

کاتێ هۆشم هاتەوە بەر خۆم ، بیرم هاتەوەو بە باشی سەرنجم‌دا . دڵم وەك یەکێك بە پلایس وشاردبێتی وابوو . ئەو گوللە تۆپانەی هێنابوومن بە چوار دەوردا پەرش‌و بڵاو بووبوونەوە. لەنزیکمەوە ئۆتۆمۆبیلەکەم بە تێکشکاوی‌و هەلاهەلایی لەسەر گازی پشت کەوتبوو . تایەکانی ڕوویان کردبوە ئاسمان . چەنگیش وا لەپشتمەوە دێت .. ئەمە چۆن ؟

گوناح پێویست ناکات بشارڕێتەوە . ئەوەتە قاچم خۆی لەخۆیدا خوار بوەتەوە . تێ‌گەیشتم کەوا ئابلۆقە دراوم‌و زۆری پێ ناچێ دەبمە دیلی فاشستەکان . بۆیە وەك بریندار کەوتم . خۆت دەزانی شتی‌وا لە جەنگدا زۆر ڕوودەدات .

ئاخ ، برالە ! کارێکی ئاسان نی‌یە مرۆڤ بکەوێتە دیلی . ئەوەی بە چاوی خۆی نەیبینیبێ‌و بەسەری نەهاتبێ ، باش حاڵی نابێ ئەو زەلیلی‌یە یانێ چی .

ئەوەتا وا هاتەدی . ڕاکشاوم‌و گوێم لێ‌یە . نرکەی تانك

دێ ٠ چوار تانکی ئەڵەمانەکان ، بە هەموو گوڕێکیانەوە بەلامــدا تێپەڕین بەرەو ئەو شوێنەی من بە بارە گوللە تۆپەکەمەوە پیایدا هاتم ٠ ئای چەند بەوە پەستو دڵگیر بووم !

ئینجا تۆپەکان تێپەڕین ٠ دوایی پیادەکان هاتن ٠ بــە لایــەکی چاو تێیان دەڕوانمو دیسان ڕوومەتم لە زەوی‌یەکە گیر دەکەم ٠ چاوم دەنووقێنم ٠ دڵم ژاندەکا ٠ تەماشایان بکەم ؟ دڵم وەختــە بتەقــێ ٠

لاموابوو هەموو تێپەڕین ٠ سەرم هەڵبڕی ٠ ئەوەتــان ســەد مەترێــك دوور لێمــەوە هەنــگاو دەنێن ٠ دەڕوانــم لە ڕێگاکەوە پێچدەکەنەوەو ڕاست بەرەو لای من دێن ٠ بیرم کردەوە « ئاکامم هاتووە » ٠ دانیشتم ٠ نامەوێ بــە پاڵکەوتنــەوە بمــرم ٠ دوایی هەڵستامە سەر پێ ٠ یەکێکیان هێشتا چەند هەنگاوێکی مابوو بگاتە سەرم ، تفەنگەکەی لە شانی کردەوە ٠ ئای لە ئادەمیزاد ! چەند سەیر خوڵقاوە ٠ لەوکاتەدا نە هاوارێــك ، نە قیژەیەکم لێ بــەرز بوەوە ، نە تۆزقاڵێ ترسم لە دڵا بوو ٠ تەنیا تەماشای کابرام دەکردو بیرم دەکردەوە : « هەر ئێستا دەسترێژێکم لێ دەکا ٠ « ئاخۆ بــە سەرمیەوە دەنێ یان بە سنگمەوە ؟ وەك بە لای منەوە جیاوازیــی هەبێ ئەگەر بە هەر شوێنێکی لەشمیەوە بنێ !

کوڕە گەنجێکی قۆز بوو ٠ ڕەش‌تاڵەیەك بوو ٠لێوەکانی باریك وەك قەیتان ، چاوەکانی گرژ ٠٠ لەبەرخۆمەوە گوتم : « ئەم کابرا

بێبیرکردنەوە هەر ئێستا ساردم دەکاتەوە » • هەروەهاش بوو • پەنجەی لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکەی دانا • بێدەنگ ڕاست ڕوانیمە چاوەکانی • بەڵام یەکێکی دییان ، سەرپەل بوو یان لەو بەتەمەنتر بوو ، قیژاندی بەسەریاو پاڵێکی پێوەنا • بۆ خۆی هات بەلامەوە ، بە زمانەکەی خۆی بڵمە بڵمێکی کردو دەستی ڕاستمی گرت ، ئانیشکی نووشتاندمەوە • دەستی لە ماسوولکەکانم دا •



هەوڵیدا بدوێ : « ئا ــ ئا ــ ئا » ، ئینجا پەنجەی بۆ ڕێگاکەی ڕوەو خۆراوا درێژکردو گوتی : « هەچە ! بارگیر •• وڵاخی ناوشان پان •• دەی ، بۆ ڕایخی ئێمە بار بکێشە » • ڕووی زەمانە ڕەش بێ ، تووتەڵە سەگ بووە بە خاوەنمان !

کابرای ڕەشتاڵە سەیرێکی پۆستاڵەکانمی کرد • دەستێکی بو

درێژ کردنو گوتی : « دایانکەنە ! » • لەسەر عەرزەکە دانیشتمو پۆستاڵەکانم بۆ داکەندو دامنە دەستی • پەلاماری دانو یەکسەر لە دەستمی هەڵپڕووکاندن • گێتەرەکانیشم بۆ لە قاچم کردەوەو ئەوانیشم دایە دەستی • لەژێریشەوە سەیرێکیم کرد ، بەڵام ئەو شیراندی بەسەرماو بە زمانەکەی خۆی کەوتە جنێو پێدانم • دیسانەوە دەستی دایەوە تفەنگەکەی : ئەوانی‌تریان دایانە قاقای پێکەنین •• ئیتر هەموو هێدی هێدی بەجێ‌یان‌هێشتم ، ڕەشتاڵەکەیان نەبێ کە تا گەیشتە سەر ڕێگاکە چەند جارێك ئاوڕی لێ دامەوە • چاوەکانی زەق ، دەبریسکانەوە ، وەك گورگی تووڕە وابوو ، لەبەرچی ؟ وەك بڵێی من پۆستاڵم لە پێی ئەو داکەندبێ ، نەك ئەو لە پێی من !

براله ، بڵێم چی ! بۆ کوێ بچوومایە ؟ ناچار چوومە سەر ڕێگاکە ، تێر جنێوم داو بەرەو خۆراوا هەنگاوم نا ، بۆ دیلی ••

لەوکاتەدا ڕێبوارێکی پەك‌کەوتە بووم • لە سەعاتێکدا کیلۆمەترێك زیاترم بڕ نەدەکرد • دەمویست بۆ پێشەوە هەنگاو بنێم ، بەڵام بەم‌لاو بەولادا دەکەوتم •• وەك سەرخۆش ڕەتم‌دەدا ، کەمێك ڕۆیشتم • کاتێکم زانی پۆلێك دیل گەیشتنە لام • هەموو سەربازی هەمان تیپ بوون کە منی تێدا بووم • دە سەربازێکی ئەڵەمان پێش خۆیانیان دابوون • دیلەکەی لەپێشیانەوە دەڕۆیشت هاتە لامەوە • هیچ قسەیەکی خراپمان لەگەڵ یەك نەکردبوو ، کەچی لەپڕ یەکێ لە سەربازەکان قۆناخە تفەنگێکی ماڵی بە تەپڵی سەرما •

وەخت بوو بکەوم‌و لەسەر عەرزەکە خپ ببم ، بەڵام باش بوو هەڤاڵەکانم خێرا پەلیان گرتم‌و خستمیانە ناوەڕاستی ڕیزەکەوە • نیو سەعاتێك لە بن باڵما بوون • هەڵیان گرتبووم • کە هۆشم پیادا هاتەوە، یەکێکیان بەئەسپایی بەگوێدا چرپاندم : « بکەوی ، خواش بە خوایی خۆی ناگاتە فریات •• دوا تۆزکی هێزت بخەرە کار ، ئەگینا دەتکوژن » • منیش زۆرم لەو هێزەی مابووم ـ کردو هەنگاوم هەڵهێنایەوە •

هەر کە خۆر ئاوا بوو ئەڵەمانەکان پاسەوانی‌یان لەسەرمان زیاتر کرد • بیست سەربازێکی‌دی‌یان خستینە تەك • سەربازەکان کەوتنە پەلەپەل کردن لێمان‌و پێ‌یان پێ هەڵگرتین • بریندارەکانمان فریا نەدەکەوتن بە پەلە بڕۆن ، دوا دەکەوتن ، ئەوانیش هەر لەو سەر ڕێگایە دەسڕێژیان لێ دەکردن‌و دەیانکوشتن • دوان ویستیان هەڵبێن ، ئەوەیان لێك نەدابووەوە بە شەوی مانگەشەو لە بەرچاو ون نابن ، دەبینرێن • دیارە دەسڕێژێکیان لەمانیش کرد • لە دەوروبەری نیوەشەودا گەیشتینە دێیەکی نیمچە سووتاو • بۆ نووستن کردیانینە کلێسەیەکی گومەز ڕووخاوەوە • لەسەر ئەو زەوی‌یە ساردە بەردینە پارچە حەسیرێك نەبوو ، ئێمەش هەموو بێ‌پاڵتۆ ، تەنیا جلە سەربازی‌یەکەمان لەبەردابوو ، ئیتر نوێنی چی ؟ هەندێکمان تەنانەت جلە سەربازی‌یە سووکەکەشی نەبوو ، تەنیا کراسێکی لەبەردا بوو • زوربەمان قوماندەی بچووك بوون ، جلی ڕەسمی‌یان فڕێدابوو ، تا نەیانناسنەوەو بە سەربازیان تێ بگەن • هەروەها

تۆپچی‌یەکانیش بە بەرگی سەربازی‌یەوە بوون • هەندێکی کەش بە چ بەرگێکەوە لە شەڕدا بوون ، هەر بەو بەرگەوە کەوتبوونــە داوی دیلی‌یەوە •

شەوێ بارانێکی ئەوەندە توند باری گیانمان هەموو خووسایەوە• گومەزەکەش کە گوللە تۆپی قورسی تێ گیرابوو ، یان لە فڕۆکەوە بۆمبای بەرکەوتبوو ، بەچەشنێك هەرەسی هێنا بانــەکەی هەمــوو لەگەڵدا هاتەخوار ، تەنانەت لە میحرابەکەشدا جێــگایەکی وشــك نەمایەوە • ئەوشەوە تا سبەینێ لەو کڵێسەیەدا وەك مەڕ لە پشتیری تاریکدا بردمانەسەر • لە نیوەشەودا گوێم لێ‌یە وا یەکێك هــاوە بەلامەوە دەست‌دەدا لە دەستمو دەپرسێ : «هاوڕێ ! بریندار نیت ؟ » وەڵامم دایەوە : « براله ! چیت‌دەوێ لێم ؟ » وتی : « من پزیشــکی سوپاییم ، بەڵکو بتوانم یارمەتی‌یەکت بدەم » • تێم‌گەیاند کەوا شانی چەپم خڕەی دێو خەریکە دەئاوسێو ئێجگار ژان‌دەکا • بێ سێو دوو گوتی : «چاکەتو کراسەکەت داکەنە»• هەمووم لەبەرم داماڵی• بە پەنجە باریکەکانی دەستی‌کرد بە پەنجە هێنــان بــە شانمــدا • ئەوشەوە قیامەتم بەم دوو چاوەی خۆم بینی • لەتاوانا ددانەکانم بەسەر یەکدا دەهێنا • پێم‌گوت : «دیارە تۆ پزیشکی ئاژەڵی ، نەك پزیشکی مرۆڤ • چی‌یە ، بۆ وا قایم دەست بە شوێنــە ئازارکــردووەکانی لەشمدا دێنیت ؟ بۆ کابرایەکی ئەوەندە بێ‌بەزەییت ؟ » بــەڵام ئــەو هەر دەستی پیا دەهێناو ، بە دەم ئەوەشــەوە بــە تووڕەیی‌یــەکەوە وەڵامی‌دامەوە : « ئیشی تۆ ئەوەیە بێ‌دەنگ بی • قسەی زیاد مەکە •

خۆت ڕاگره • ئێستا ئازارت زیاد دەكات » • هەی هاوار ! كە دەستمی ڕاتەكاند ، چاوم پریشكی ئاگری سووری لێبووەوە • گوتم « چیدەكەیت هەی فاشیستی بەدبەخت ! من شانم وردو خاش بووە، كەچی تۆ وا قایم ڕایدەتەكێنێ ! » • گوێم لێ بوو پێكەنینێكی بەئاستەمی كردو گوتی:«وامدەزانی بە دەستی ڕاستت تێمدەسرەوێنی، بەلاّم بۆم دەركەوت لاوێكی هێمنی • شانت نەشكابوو ، لەجێچوو بوو • بۆم گرتیتەوە • ها ئێستا چۆنە ؟ ئازارەكەی كەمتر نەبوو ؟ » • ڕاستەكەی هەستم بە خۆم دەكرد كەوا ئازارەكەم خەریكە دەڕوات • لە ناخی دلّمەوە سوپاسم كرد • ئەویش بەرەو تاریكایییەكە هەستا ڕۆیی • بە هێواشی لەبەرخۆیەوە دەیپرسی : « كەس هەیە بریندار بێ ؟ » • پزیشكی ڕاستەقینە ئاوا دەبێ • لە زیندانیشا ئەركی پیرۆزی سەرشانی خۆی بەجێدێنێ •

شەوێكی سەخت بوو • تەنانەت ڕێگای چوونە سەر پێشاویشیان نەدایین • هەر كە كردیانینە ژووری كلّێسەكەوە سەرۆكی پاسەوانەكان لەمبارەوە ئاگاداری كردین • یەكێك لە برادەرە خواپەرستەكانمان ، وەك بلّێی خوا تۆلّەی گوناحێكی لێ بسێنێتەوە ، پێویستی بە پێشئاو بوو • خۆی توند گوشی • ماوەیەك خۆی هێناو خۆی برد ، بەلاّم سەرەنجام خۆی پێ ڕاگیر نەكرا ، دەستی كرد بە گریان•• گوتی : «میحرابی پیرۆزم پێ پیس ناكرێ ! من كابرایەكی دیندارم •• مەسیحیم •• برادەرینە ! چیبكەم ، چارەم چییە ؟ » • دەزانی ئێمە چمیللەتێكین ؟ یەكێك پێدەكەنێ • هەندێك جنێو

دەدەن • بەشێکیش گاڵتەی پێ دەکەن و ڕاوێژی نابەجێی بۆ دەکەن • ئەو هەموویانی هێنابوە پێکەنین • بەڵام مەسەلەکە سەرەنجام خراپ کۆتایی هات ، بەڵکو ئێجگاریش خراپ •• کابـرا دەستی کرد بـە دەرگا کوتاندنەوەو داواکردنی ڕێدانی بۆ چوونە سەر ئاو ، بـەڵام ئای •• داواکەیان چۆن بەجێ هێنا ! پاسەوانە فاشستەکە لەودیوی دەرگاکەوە بە هەموو مەودای ئەملاو ئەولای خۆیدا دەسترێژێـکی زۆری کردو کابرای دینـداری ســاردکردەوە • هەروەهـا ســێ کەسی تریش کوژران • یەکێکیش زۆر خراپ برینـدار کـرا • ئەویش دەمەوبەیان گیانی سپارد •

کوژراوەکانمان هەموو لە شوێنێـکدا کـۆکردەوە • هەمـوو بێدەنگ دانیشتین • نوقمی دەریای بیرکردنەوە بووین • سەرەتـا زۆر خۆش نەبوو ، بەڵام پاش کەمێك بە چپەو بە دەنگێکی نزم کەوتینە قسەکردن لەگەڵ یەك : کێ خەڵکی کوێیە ؟ کێ چۆن بە دیل گیرا؟ هاوڕێیانی یەك لق یاخود یەك تیپ لە تاریکاییدا لە یەك ون بووبوون• دەستیان کرد بە بانگ کردنی یەکتر • لە تەنیشتمەوە گوێم لە قسەی یەکێك بوو بە دەنگێکی کپ بە یەکێکی تری دەگـوت : « ئـەگەر سبەینێ بەرلەوەی بمانخەنە ڕێ ، ڕیزمان بکەن و بپرسن : کـێ قوماندانە ، کێ کۆمۆنیستە ، کێ جوولەکەیە ، نەتکردبێ خـۆت گێل بکەی و بتەوێ خۆت بشاریتەوە ! کارت بەوە ئاســان نـابێ و ڕزگارت ناکات • تۆ لات وایە هەر بەوە کە بـەرگی قوماندانیـت فڕێداوە ، ئیتر بە سەربازت تێدەگەن ؟ ئەمەت بۆ تێنابەڕێ ! یەکەم

کەس من پەنجەت بۆ ڕادەکێشم ! من دەزانم تۆ کۆمۆنیستی • وەختی خۆی کەوتبوویتە بن کڵیشەی من کە بێمە پارتی‌یەوە • دە فەرموو وەڵامی کردەوەی خۆت بدەرەوە » • ئەوەی ئەم قسانەی دەکرد لای چەپی منەوە دانیشتبوو • لەودیویەوە دەنگی لاوێك بەرزبووەوە ، لە وەڵامدا پێی گوت : «کریژنێف ! دیارە تۆ پیاوێکی باش نیت • من هەمیشە گومانم لە تۆ هەبوو ، بەتایبەتی کاتێ کە قوبووڵت نەکرد بێیتە پارتی‌یەوەو بیانووت بەوە دەهێنایەوە کەوا نەخوێندەواریت • بەڵام من هەرگیز بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو بتوانی خۆت بفرۆشی • تۆ لای خۆت قوتابخانەی حەوت ساڵیت تەواو کردووە ! » • کابرا بە تەمەڵی‌یەکەوە وەڵامی‌دایەوە : « جا چی‌یە ، با تەواوم کردبێ !»• ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوون • دوایی قوماندانەکە بە نەرمی پێی‌گوت : « هاوڕێ کریژنێف ! پیاو بە ئیعتیرافم لەسەر مەکە » ، کریژنێف کەمێك پێکەنی ، پاشان گوتی : « هاوڕێ ئەوانەن لە مەیدانی شەڕدان • من هاوڕێی تۆ نیم‌و داواشم لێ مەکە ئیعتیرافت لەسەر نەکەم • ئیعتیرافت هەر لەسەر دەکەم • ژیانی خۆم لا خۆشەویستترە •• » •

ئەوان بێدەنگ بوون ، بەڵام گڕی نامەردیی ئەو کابرا هەموو گیانی منی هێنایە کوڵ • بیرم کردەوە • لە دڵی خۆمدا گوتم : نەخێر ، کوڕی سەگ ! نابێ بێڵم ئیعتیراف لەسەر قوماندانەکەت بکەی ! لەم کڵێسەیە لە دەستم دەرباز نابێ • دەبێ وەك سەگی تۆپیو کلکت بگرن‌و فڕێت‌دەنە دەرێ » • دنیا کەمێك ڕوون‌بووەوە • بینیم لە

تەنیشتمەوە بۆرە زەلامێکی حەیتەی کەللە زل لەسەر گازی پشت خۆیداوە بە زەویدا ، دەستی ناوەتە ژێر سەری • لەولاشیەوە لاوێکی لاوازی لووت کوڵ دانیشتووە ، تەنیا کراسێکی لەبەردایە ، دەستی داوەتە بەر ئەژنۆی و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە • بیرم کردەوە : ئەم لاوە دەرەقەتی ئەو ئەسپە چوار پەل قەوی یە نایەت • چار چی یە ؟ دەبێ من لەناوی بەرم •

دەستم خستە سەر دەستی کوڕە لاوەکەو بە چپە لێم پرسی : « تۆ قومندانی ؟ » • هیچ وەڵامی نەدامەوە • تەنیا سەرێکی بۆ لەقاندم • پەنجەم بۆ کابرای ڕاکشاو درێژ کردو گوتم : « دەیەوێ ئیعتیرافت لەسەر بکات ؟ » • کوڕە دیسانەوە سەرێکی لەقاند • پێم گوت : « ئادەی قاچەکانی بگرە بۆئەوەی لنگەفرتێ نەکات • خێرا کە دەی !» • خۆیشم خۆمدا بەسەریاو پەنجەکانم لە بینەقاقەی گیر کردە • تەنانەت فریای هاوارکردنیش نەکەوت • دەقیقەیەك لەژێر خۆممدا هێشتەوە ، دوایی لاچووم • کابرای خۆفرۆشتوو زمانی شکاو ژیانی تەواو بوو •

کە لێ بوومەوە زۆرم بێزهاتەوە • ئارەزووی دەستشتنم دەکردە وەك بڵێی مرۆڤ نا ، بەڵکو مارم خنکاندبێ • یەکەمجار بوو لە ژیانمدا کەسێ بکوژم ، ئەویش کێ ؟ یەکێك لە خۆمان ! بەڵام کەی ئەو لە خۆمان بوو ؟ هەستامە سەر پێ و بە کوڕە قوماندانەکەم **گوت :** « هاوڕێ ، با بچینە سووچێکی کەوە • کڵێسەکە گەورەیە » •

هەر وەك ئەو كريژنێڤە گوتی ، بەيانی هەموومانيان لای كڵێسەكەوە ڕیز كرد • لوولەی تفەنگ‌و شەستیر دەبریسكايەوە •
سێ ئەفسەر كەوتنە لاخستنی ئەوانەی ترسيان لێ‌يان هەبوو • پرسی‌یان : كێ كۆمۆنیستە ، كێ قۆماندان‌و قۆمیسەرە ؟ بەڵام كەس بەدەرنەكەوت • هەروەها هیچ نامەردێكیش لەناوا نەبوو • ئەگەر هەبوايە دەيتوانی خەڵكێكی زۆر پێوەبكا ، چونكە نزيكەی نيوەمان كۆمۆنیست بوون • قوماندان‌و قۆمیسەریش هەروا هەبوون • لەو هەموو خەڵكە كە پتر لە دووسەد كەس دەبوون ، تەنيا جوولەكەيەك‌و سێ ڕووسيان برد • ئەو ڕووسانەش پێوە بوون ، چونكە هەرسيانيان قژيان ڕەش‌و لوول بوو • ئەوەبوو چوونە بەردەمی يەكێكيان‌و لێ‌يان‌پرسی : « تۆ جوويت ؟ » • وەڵامی دايەوە : « من ڕووسم » ، بەڵام تەنانەت گوێشيان بۆ شل‌نەكرد • نەڕانديان بەسەريدا « وەرە دەرەوە لە ڕیز » • دەستڕێژێكيان لەو مەردانە كردو ئێمەشيان دايە پێش • قوماندانەكەی ، خۆفرۆشتووەكەم لەگەڵيا خنكاند تا ( پۆزنان ) هەر لە تەنيشتمەوە دەڕۆيشت‌و بەدزی‌يەوە دەستمی دەگووشی • لە ( پۆزنان ) لێكيان جوێ‌كردينەوە •

براله ! سەير كە مەسەلەكە چۆنە •• هەر لە يەكەم ڕۆژەوە بيرم لەوە كردەوە چۆن بگەڕێمەوە بۆ ناوجەرگەی شەڕ • بڵێم چی ؟ تا برديانينە كامپی بەديل‌گيراوەكان لە پۆزنان ، تاقە جارێك چی‌يە هەلی لەبارم بۆ هەڵنەكەوت ڕابكەم • بەڵام لە كامپەكەی پۆزنان ئەو هەلەم بۆ ڕەخساە لە كۆتايیی مانگی مايسدا بوو نارديانينە

دارستانەکەی نزیك کامپەکەمان گۆڕ بۆ دیلە مردووەکانی خۆمـان هەڵکەنین • لەوسەردەمەدا زۆر لە هاوڕێکانمان بە دەردی زەحیری گیانیان بە خاك دەسپارد • وا خەریکم گڵی پۆزنان هەڵدەدەمەوەو بە دەوروبەری خۆماندا دەڕوانم • سەرنجمدا دوان لە پاسەوانـەکان دانیشتن‌و دەستیان کرد بە نان‌خواردن • سێ‌یەمیشیان لەبەر هەتاوەکە وەنەوزی دەدا • پاچـەکەم فـڕێ‌داو بەهێـواشی چوومـە پشـت درەختەکانەوە • دوایی هەڵاتم‌و ڕاست ڕێگەی خۆرهەڵاتم گرتەبەر •

پاسەوانەکان نەیانتوانی زوو بمگرنەوە • منێـکی ماندوو برسی ئەو هەموو هێزەم لەکوێوە هەڵدەهێنجا کە لە شەوو ڕۆژێکدا توانیم نزیکەی چل کیلۆمەتر ڕێ ببڕم ؟ بەڵام ئاواتەکەم نەهاتەدی • لـە ڕۆژی چوارەمـدا ، کاتێـك کـە لـــەو کامپـە نەتەویســـتە زۆر دوورکەوتبوومە ، گرتمیانەوە • سەگیان دواخستبووم‌و بە بۆن‌و شوێن پێدا لە تەویلەیەکدا دۆزیمیانەوە •

سبەینانێ بوو • دارستانەکە پتر لە سێ کیلۆمەتری مابـوو ، بەڵام نەموێرا لەوەپاش بە دەشتی بێ‌دارو درەختدا بڕۆم • نـاچار خۆم لە تەویلەیەکدا حەشار دا • مشتێ جۆم کردە ناودەمم‌و کەوتمە کرماندنی • هەندێکیشم بۆ تەنگانە کردە گیرفانم • لەناکاو گوێـم لە حەپەی سەگ بوو • ماتۆڕیش وڕەی هات • دڵم داخورپـا ، چونکە دەنگی سەگەکان تا دەهات نزیـك دەبووەوە • پـاڵ‌کەوتم‌و ڕووی خۆمم بە لەپم داپۆشی ، بۆئەوەی هەر هیچ نەبێ دەم‌وچاوم نەڕنن • سەگەل خۆیان‌کرد بەژووردا • لە ماوەی چاوتروو کاندنێکا

هەرچی شرەو پڕەیەکم پێوەبوو هەموویان لەبەر داماڵیم • بە ڕووتو قووتی ، وەك چۆن لە دایك بووبووم ، مامەوە • بەسەر عەرزەکەدا بە ئارەزووی خۆیان تلاو تلیان پێ دەکردم • بەر لە کۆتاییش گەماڵێکیان بازیدایە سەر سنگمو چنگی لە قوڕگم گیرکرد ، بەڵام جارێ هیچی لێ نەکردم •



ئەڵەمانەکانیش بە سواریی دوو ماتۆڕ گەیشتن • لەپێشدا بە ئارەزووی خۆیان تێر تێر کوتامیان • دواییش سەگەلەکەیان تێبەردامەوە • سەگەل پێستیان بە لەشمەوە نەهێشت • بە قەپاڵ گۆشتیان لێ دەپچڕیم • بە ڕووتو قووتیو لەشی خەڵتانی خوێنەوە بردمیانەوە کامپی دیلەکان • لە سزای هەڵاتندا مانگێك لە ژووری سزایان توند کردم •

براله ! یادکردنەوەی دەردو مەینەتی کامپی دیلەکان کارێکی جەرگبڕە • خۆ گێڕانەوەی ، ئەوە هەر مەپرسە • کە بیر لەو

سزادانه درِندانەیه دەکەیتەوە لە ئەڵەمانیا چێشتمان ، یان کە ئـەو هاوڕێو برادەرانه دێنیتەوە پێش چاو کە لە کامپی دیلەکانا بەدەم ئازارەوە دەتلانەوەو دەکوژران ، دڵ لە سنگ دەردەپەڕێو قوڕ ئك دەکەوێتە پرتەپرتو هەناسە سوار دەبێ •

لە ماوەی دوو ساڵی دیلیدا بۆ کوێ‌یان نەناردمو چی‌یان بەسەر نەهێنام ! لەو ماوەیەدا نیوەی ئەڵەمانیام کرد • لە (ساسکۆن) لـە کارگەی پلاستیك کارم دەکرد ، لە ناوچەی (ڕووڕس) خەڵووزم لە کانـەوە دەگوێزایـەوە ، لە (باڤاریـا) زەویـم هەڵدەکەنـد ، لـە (توورینگ)یش ئیشـم دەکـرد • بـە زۆر سەرانسـەری وڵاتـی ئەڵەمانیایان گێڕام • براله ! سروشتی ئەو وڵاتە سروشتێکی هەمـە چەشنه ، بەڵام لە هەمووڵایەکی وەك یەك براکانمانیان دەبـڕیو دەکوشت •• ئـەو چەپەڵو بێ‌ویژدانه نەعلەتی‌یانە بە چەشنێـك لێ‌یان‌دەداین لای ئێمە وا لە درندەش نادرێ • بە مست ، بە شەق ، بە قامچی ، بە ئاسن لێ‌یان دەداین •• گوێ‌یان نەدەدایە ، هەرشتێك دەستی پیا ڕابگەیشتایە تێ‌یان دەسرەواندین • خۆ بـاسی قۆناغـە تفەنگو ئەو جۆرە شتانه ، ئەوە هەر ناکرێ •

لێ‌یان دەداین لەبەرئەوەی ڕووس بوویـن •• لەبەرئـەوەی هێشتا تەماشای جیهانی ڕوونمان دەکرد •• لەبەرئەوەی زەحمەتمان بۆ دەکێشـان •• لەبەرئـەوەی ڕۆیشتنمانیـان بـە دڵ نەبـوو •• لێ‌یان‌دەداین بۆئەوەی بمانکوژن •• بۆئەوەی لە دنیادا نەمێنین •• بەڵام دۆزەخی ئەڵەمانیا بەشی هەموومانی نەکرد ••

خواردن لە سەرپاکی کامپەکاندا وەك یەك بوو : سەدو پەنجا گرام کولێرەی نانی هەرزنی پڕ لە سۆس‌و تۆزێك شۆربای شێلم • پیاڵەیەك ئاوی گەرم لە شوێنێك دەیانداو لە شوێنێکی کە ئەوەش نەبوو • پێویست بە باس کردن ناکا ، خۆت حوکم‌بدە : من بەر لە شەڕ هەشتاو شەش کیلۆ بووم ، بەڵام دەمەو پایز لە پەنجا کیلۆ پترم نەمابووەوە ، تەنیا پێستێکی بە ئێسقانەوە نووساو بووم • هێندە بێ‌هێز بووبووم ئێسقانەکانیشم پێ بەڕێوەنەدەچوون • لەگەڵ ئەوەش هەمیشە دەیانشیراند بەسەرما : یەڵلا ، دەی کار بکە • خۆ ئەگەر وشەیەکت بەدەمدا بهاتایە ، کارێکی هێندە گرانیان دەدای بەسەردا بە ئێسترێکی زەبەللاح نەکرێ •

ئێمە کە سەدو چل‌و دوو دیلی سۆڤیەتی بووین ، لە سەرەتای ئەیلوولدا لەو کامپی دیلانەی قەراخ شاری ( کیۆسترین )ەوە گواستیانینەوە بۆ کامپی دیلانی ( ب ــ ١٤ ) کە دەکەوتە نزیك شاری (درێزدن)ەوە • ئەم کامپە لەوکاتەدا نزیکەی دووهەزار کەسی دیلی لە ئێمە تێدابوو • هەموو لە کانە بەردەکان ئیشمان دەکرد • بەردی ئەڵەمانیامان دەبڕی ، دەمان‌شکاند ، وردمان دەکرد • هەر یەکێکمان دەبوو ڕۆژی چوار مەتری شەش‌ڕوو (مکعب) بەرد ئامادەبکا • ئەمە ئێجگار زۆر بوو • بەڵێ بە بێ ئەم مەینەتەش گیانمان بە دەزوویەکی قرچۆکەوە بەلەشمانەوە بەند بوو • فەرموو وا ئەنجام دەستی کرد بە دیاری‌دان : پاش دوو مانگ ، لە کاروانە سەدو چل‌و دوو کەسی‌یەکەی ئێمە پەنجاو حەوت کەسی مایەوە • براله ! ئەمە چۆن

کارەساتێکە ؟ لێرە خۆ فریای مردوونناشتن ناکەوی ، کەچی سەرباری ئەوە بەکامپی دیلەکانا واتەوات دادەکەوێ کەوا ئەڵەمانەکان ستالینگرادیان داگیرکردو خەریکن بەرەو سیبیریا دەڕۆن • خەم لەسەر خەم وا مرۆڤ دەچەمێنێتەوە • چاوی لە زەوی بۆ هەڵنابڕرێ • پاسەوانانی کامپەکەش بەدرێژایی ڕۆژ بە دەنگی بەرز گۆرانی دەڵێن ، قاقا لێدەدەن و دڵخۆشیی خۆیان دەردەبڕن •

ڕۆژێکیان ئێوارە لە کار گەڕاینەوە بۆ کامپەکە • بەدرێژایی ئەوڕۆژە باران شەصتو ڕەهێڵەی دەکرد • لەشمان هەموو خووسابووەوە • بایەکی ساردیش ئێسقانمانی دەسمی • ددانە چۆقەمان پێکەوتبوو • جێیەك نەبوو خۆمانی تیا وشك کەینەوە ، خۆمانی لێ گەرم کەینەوە • لەگەڵ ئەوەشدا هێندە برسیمان بوو مردنمان لەو حاڵە پێ خۆشتر بوو ، کەچی سەرەڕای هەموو ئەوە ئەو ئێوارەیە نانیشیان نەداینێ •

بەرگە شڕە تەڕەکەمم لەبەرم داماڵی • فڕێمدایە سەر تەختەکەمو گوتم : « وەرە ڕۆژی چوار مەتری شەش ڕوو بەردیان بۆ ئامادە کە ، کەچی بۆ گۆڕی هەر یەکێك لە خۆمان مەترێکی شەش ڕوو سەرو زیادە » • هەر ئەوەندەم گوت ، کەچی لەناو خۆماندا نامەردێك پەیدابوو ئەو وشە تاڵانەی منی گەیاندە قوماندانی کامپەکە •

قوماندانی کامپەکەمان (میووللەر)ی ئەڵەمانی کابرایەکی کورتە باڵای تێکسمڕاو بوو • خۆی و سەرو برۆو برژانگی هەموو سپی

بوون• زۆر باش بە ڕووسیقسەی دەکرد • وەك منو تۆ • (ئۆ)یشی
قەڵەو دەردەبڕی ، وەك بییەوێ پیشانی بدا کەوا ڤۆلـگاییـیـەکی
ڕەسەنە • لە جنێوداندا وەستای چاك بوو • نازانم ئەو لەعنەتییـە
ئەو زانستەی لەکوێ خوێندبوو •

وادەبوو لەپێش بینای کامپەکەدا کە ئەوان (بەڕاك)یان پـێ
دەگوت ـ ڕیزیان دەکردین • ئەو خۆی پێش سـەگە نـازییەکان
دەکەوتو بـە بەردەممانـدا تێدەپـەڕی • دەسـتی ڕاسـتی ڕەپ
ڕادەگرت • دەستکێشی چەرمی لەدەستدا بوو • دەستـکێشەکانیشی
تەلی قوڕقوشمیان تیدا بوو تاکو پەنجەکانی ئازاریان پـێ نـەگات •
دەڕواو بە لووتی یەك بە یەکمانیدا دەکێشـێو خوێنـی پـێ لـێ
بەردەداتەوە • بە پێکەنینێکیشەوە دەیگوت ئەمە بۆ خۆ پاراسـتـن
لە ئەنفلەوەنزە چاکە •

هەموو ڕۆژێ ئەمە پیشەی بوو • سەرانسەری کامپەکە لـە
چوار خـانوو پێکهاتبوو • ئەمڕۆ پزیشکی خـانووی یەکەم دەبـوو ،
سبەینێ هیی دووەمو ••• هەمیشە هەر بەمجۆرە • کەماڵێکی هێندە
ڕێکوپێك بوو ڕۆژانی پشوویش هەر کاری دەکرد •

ڕۆژێ دوای ئەوەی قسەکـەم لەمـەڕ مـەترە شـەشڕووە
بەردەکە کرد ، ئەم قوماندانە بانگی کردم بۆ لای خۆی • ئێوارە بوو
وەرگێڕەکە خۆی کرد بە ژووردا • دوو پاسەوانیشی لەگەڵ بوو •
پرسی : « سۆکۆڵۆف کێیە ؟ » •

وەڵامم دایەوە : «منم» • گوتی : « خێرا دوامان کەوە• قوماندانی کامپ داوای کردوویت » • تێگەیشتم بـۆچیی داواکردووم • بـۆ کوشتن •

خوا حافیزیم لە هاوڕێکانم کرد • هەموو دەیانزانی بۆ مردن دەڕۆم • هەناسەیەکم هەڵکێشاو ڕۆیشتم • وا بە حەوشی کامپەکەدا تێدەپەڕم ، دەڕوانمە ئەستێرەکانی ئاسمان • خواحافیزی لەوانیش دەکەم • بیردەکەمەوە : « ئای سۆکۆڵۆف ! مەینەتو عەزابت دی• لە کامپی ژمارە سێ‌سەدو سی‌دا یەکەمیت پچڕی » • بەزەییم بـە ئیریناو منداڵەکانمدا هاتەوە • بەڵام دوایی بەزەیی‌یەکەم نیشتەوەو خۆم توند کردەوەو غیرەتم دا بەر خۆم تا وەك سەربازێکی نـازا ، بێ‌ترس تەماشای کونی لوولەی دەمانچەکە بکەم ، بۆئەوەی دوژمنان لە دوا دەقیقەی ژیانمدا وا نەیەتـە پێـش چاویـان کەوا لە ژیـان جویێ‌بوونەوەم لا گرانە •

چەپکەگوڵ لەسەر پەنجەرەکانی ژووری قوماندان دانرابوون• ژوور پاك‌و خاوێن ، وەك یانە چاکەکانی ئێمە • بەڕێوەبەرانی کامپەکە هەموو لەدەوری مێزەکە دانیشتبوون • پێنج کەس بوون • خەریکن ئارەقی (شناپس) هەڵدەدەن‌و قاورمە دەخـۆن • لەسـەر مـێزەکە قاپێکی گەورەی شناپس ، نان ، قاورمە ، سێو ، قوتووی خۆراکـی هەمەچەشنەی ناوپاکەت دانرابوو • بە لاچاوێك سەیرێکی ئـەو هەموو خواردەمەنی‌یەم کرد ـ ڕەنگە بڕوام پێ نەکەی ـ هێندە دڵم تێکەڵ هات • خەریك بوو بڕشێمەوە • مـن وەك گـورگی بـرسی

وابووم • له خواردەمەنیی ئادەمیزاد تەرە بووبووم ، جا وەرە ئــەو هەموو خواردەمەنی‌یە خۆشەت لە بەردەمدا بێ !

بە هەرجۆرێ بوو دڵ تێکەڵهاتەکەم لە بیر خۆم بردەوە ، بەڵام چاوترووکاندن لە مێزەکە هێزێکی مەزنی دەویست •

میوولله‌ر بە نیمچە سەرخۆشی‌یـەکەوە بەرانبـەرم دانیشتبوو ، یاریی بە دەمانچەکەی دەکرد • لەم دەست هەڵی‌دەدایە ئەو دەستو تەماشای منی دەکردو وەك مار چاوی نەدەترووکاند • بە دەســتو قاچی بریندارەوە هانمە پێشەوەو بە دەنگێکی بەرز خۆم پێشکەش کرد:

ـ من سۆکۆلۆڤی دیلم • بە فەرمانی ئێوەی قوماندان هاتوومەتە ئێرە •

ـ ها چی‌یە ، ئیڤانی ڕووس ! ئامادەکردنی چوار مەتری شەش‌ڕوو بە زۆر دەزانی ؟

لە وەڵامدا گوتم •

ـ بەڵێ ، قوماندان ! بێ‌گومان زۆرە •

ـ مەترێك بەشی گۆڕت دەکات ؟

ـ قوماندان ! بەتەواوی بەشی دەکاتو لێشی دەمێنێتەوە •

هەڵستایە سەر پێ • گوتی : « من شەرەفێـکی گەورەت پــێ دەبەخشم • هەر ئێستا لەسەر ئەو وشانە خۆم ڕیزێکت لێ دەکەم • لێرەدا جوان نی‌یە ، با بڕۆینە حەوشە • لەوێ نیشانت‌دەدەم » •



پێم گوت : « ئارەزووی خۆتە » • ڕاوەستاو بیرێکی کردەوە • دوایی دەمانچەکەی لەسەر مێزەکە داناو پەرداخێکی پڕ شناپسی بۆ تێ کردم• پارچەیەکیش نانی هێناو پلێك قاورمەی لەسەر دانا • ئەمەی هەموو دایە دەستمو گوتی : « ئیڤانی ڕووس ! پێش ئەوەی بمری ئەم پێکە لە سەرکەوتنی چەکی ئەڵەمان بخۆرەوە » •

پەرداخو مەزەکەم لە دەستی وەرگرت • بەڵام هەر کە گوێم لەو وشانە بوو ، وەك بزووتکم پێوە بنێن وابوو • لەبەرخۆمەوە بیرم کردەوە ، گوتم : « سوپاس بۆ ئەو میوانداری یە ، بەڵام من

ناخۆمەوە»• بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی : «حەزناکەی لە سەرکەوتنی ئێمە بخۆیتەوە ؟ کەواتە لە مەرگی خۆت بیخۆرەوە » • چیم لەکیس دەچوو ؟ پێم‌گوت : « لە مەرگی خـۆم‌و ڕزگاربـوون لە عـەزاب دەیخۆمەوە » • بەدەم ئەو قسانەوە پەرداخەکەم هەڵگرت‌و بە دوو قوم چۆڕم لێ بڕی ، بەڵام دەستم بۆ مەزەکە درێـژ نـەکرد • بـە ناسکی بـە لەپی دەست لێوەکانم سڕی‌و گوتم : « سوپـاس بـۆ ئەو میوانداری‌یە ، قوماندان ! من ئامادەم ، با بڕۆین ، بمکوژە » •

قوماندانەکە ورد ورد تەماشای دەکردم • گوتی : « تۆ هیچ نەبێ بەر لە مردن شتێك بخۆ » • لە وەڵامی ئەو قسەیەدا گوتم : « عادەتم نی‌یە لەگەڵ پەرداخی یەکەمدا مەزە بخـۆم » قومانـدان پـەرداخی دووەمی بۆ تێ‌کردم • ئەویشم هەڵقوڕاند • ئەمجاریش دەستم بـۆ مەزەکە نەبرد • دەماری ئازایەتیم تەواو لێی دا • بیرم‌کردەوە ، لە دڵی خۆمدا گوتم : « خۆ هیچ نەبێ بەرلەوەی بڕۆمە حەوشەو لە ژیان جوێ بمەوە ، تێر دەخۆمەوە » • قوماندان برۆ سپی‌یەکانی هەڵبڕی‌و پرسی : « ئیڤانی ڕووس ! چی‌یە ، بۆ مەزەی لەگەڵ ناخۆی • بـێ شەرم‌کردن پێم‌گوت : « قوماندان ! ببوورە • من فێر نەبووم دوای پەرداخی دووەمیش مەزە بخۆم»• قوماندان گوێیەکانی هەڵئاوساندو لەپڕ دایە پرمەی پێکەنین • لەگەڵ قاقای پێکەنینەکەشدا بە ئەڵەمـانی کەوتە قسە•دیاربوو وتەکانی منی بۆ هاوڕێکانی وەردەگێڕا•ئەوانیش دایانە پێکەنین• کورسی‌یەکانیان وەرچەرخاندو هەموو ڕوویان کردە من • هەستم‌کرد کەوا نەرمتر لێم دەڕوانن •

قوماندان پەرداخی سێیەمیشی بۆ تێکردم • خۆشی لەبەر پێکەنین دەستی دەلەرزی • ئەم پەرداخەیانم کەمێك لەسەرخۆ خواردەوە • پارچەیەکی بچووکم لە نانەکە خواردو ئەوەی مایەوە لەسەر مێزەکە دامنایەوە • هەرچەندە لە برسانا وەختەبوو بمرم ، حەزم کرد نیشانی ئەو نەعلەتی‌یانەی بدەم کە ئەو خواردنەی ئەوان کار لە من ناکاو من غیرەتو پیاوەتیی ڕووسانەی خۆمم هەیەو ئەوان بە هەموو تەقەلاو هەوڵێکیانەوە ناتوانن بمکەنە حەیوان ••

ئەمجار ئیتر قوماندان ڕەنگی کەسێکی لێ نیشت کە بە ڕاستی بێ • دوو خاچە ئاسنینەکەی بە سنگیەوەی کردبوون ، ڕاستی کردنەوە • بێچەك لەودیو مێزەکەوە هاتەدەرێو گوتی : « سۆکۆلۆف ! تۆ سەربازی ڕاستەقینەی ڕووسی • تۆ سەربازێکی ئازاو نەبەردی • منیش سەربازمو ڕێزی دوژمنی خاوەن کەرامەت دەگرم • من ناتکوژم • ئاگادارت دەکەم کەوا ئەمڕۆ هێزەکانمان لە ڤۆلگا پەڕینەوەو ئێستا دەستیان بەسەر سەرپاکی ستالینگراددا گرتووە • ئەمە بۆ ئێمە خۆشی‌یەکی گەورەیە • لەبەرئەوە من ژیانت پێدەبەخشمەوە • بڕۆرەوە کامپەکەی خۆت • با ئەمەش پاداشتی نەبەردیت بێت • سەموونێكو پلێ قاورمەی لەسەر مێزەکە هەلگرتو دایە دەستم •

سەموونەکەم بە هەموو هێزم گرتبوو • پلە قاورمەکەیش لە دەستی چەپمدا بوو • ئەو وەرچەرخانە چاوەڕوان نەکراوەی قوماندان بە چەشنێ شڵەژاندمی ، سوپاس کردنی لە بیر بردمەوە •

وەرگەڕام بۆ دواوەو بەرەو دەرگاکە هەنگاوم‌ناو لە دڵی خۆمدا گوتم: « ئێستا لەپشتەوە تەقەم لێ دەکاو شانم هەڵدەتەکێنێ‌و خواردنەکەی دەستیشم ناگەیەنمە هاوڕێکانم • نەخێر هیچ ڕووی‌نەدا • ئەمجارەش لە مەرگ ڕزگار بووم ، بەلام کزەبای ساردی مەینەت هەر بەردەوام بوو •

بە پەلە بە پێی خۆم لە ژوورەکەی قوماندان دەرچووم • بەلام لە حەوشەکەدا هەنگاوم بە باشی بۆ نەدەنرا • هەر کە گەیشتمە قاوشی دیلەکان بێ‌هۆش لەسەر زەوی‌یە چیمەنتۆ ڕێژەکە کەوتم • هێشتا شەبەقی نەدابوو هاوڕێکانم بێداریان کردمەوە تا « بۆیان بگێڕمەوە » ! هەرچی لە ژووری قوماندانەکە ڕووی‌دابوو لێم هەمووم بۆ باس‌کردن • یەکێك لە هاوڕێکانم بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی : «خواردنەکە چۆن دابەش کەین؟» گوتم: «بەیەکسان» • چاوەڕوانمان کرد تا دنیا ڕووناك بوەوە • بە تاڵە دەزوویەك سەموونەکەو قاورمەکەمان پارچە پارچە کرد • هەریەکە هێندەی قاوغە شقارتەیەکمان بەرکەوت • هەریەکە بە حیساب بەشی خۆی وەرگرت • هەرچی قاورمەکە بوو خۆت دەزانی هەر بەشی ئەوەی دەکرد لێومانی پێ چەور بکەین ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بێ‌ئەوەی کەس مەغدوور کەین لەناو خۆمانا دابەشمان کرد •

زۆری نەخایاند سێ‌سەد کەسی شان‌و قۆڵ پتەویان لێمان نارد بۆ زەلکاو وشك‌کردنەوەو ، لەوێشەوە ناردیانین بۆ ناوچەی ( ڕووڕس )و لەوێ لە کاتێك خستیانینە کار • تا ساڵی چل‌و چوار

لەوێ مامەوە • لەودەمەدا هێزەکانی ئێمە لووتبەرزیی ئەڵمانەکانیان شکاندبوو • فاشستەکان ئیتر وازیان لە سووککردنی دیلەکان هێنابوو •

ڕۆژێکیان هەموویان ڕیزکردین • ئەفسەرێك هاتبوو وەرگێڕێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو • گوتی : « کێ لە سەربازیدا یا بەرلەوەی ببێ بە سەرباز شۆفێریی کردووە ، هەنگاوێك بێتە پێشەوە » • حەوت کەسێك کە زووتر ئۆتۆمۆبیلمان لێخوڕیبوو چووینە پێشەوە • سەرو دەست جلی کۆنی تایبەتیی‌یان داینێو ناردیانین بۆ شاری ( پۆتسدام ) •

لەوێ لێکیان جویٚ کردینەوە • هەریەکێکیان ناردین بۆ لایەك • منیان کردە شۆفێری بەشی ڕێگاوبان دروستکردنو ئامادەکردنی پێویستی‌یەکانی بەرگری •

کردمیانە شۆفێری ئەفسەرێکی ئەندازیار • ئای خوایە کە گۆشتی پێوە بوو ئەو فاشیستە ! کورتەبنە ، ورگن ، درێژیو پانیی لێك نەئەکرایەوە • پاشەڵو سمتێکی خڕی وەك هیی فڵقەکۆنێك • لەپێشەوە لەژێر چەناگەیەوە غەبغەبەی سێ چین نیشتبوە سەر یەكو بەسەر یەخەی چاکەتە سەربازی‌یەکەیدا شۆڕ بووبوونەوە • پشتی ملیشی سێ چینی ئەستوور بوو • باوەڕت هەبێ بە لانی کەمەوە سێ هۆقە بەز بە لەشی‌یەوە بوو • کە بەڕێدا دەڕۆیشت هەناسە بڕکێی پێدەکەوت • وەك شەمەندەفەر گرمە گرمی دەهات • بۆ خواردنیش

هەتا هەبوایە دەیخوارد ! ڕۆژ تا ئێوارە دەلەوەڕا • سوراحیی کۆنیاکی دەنا بەسەریەوە • جاری‌وا دەبوو منیش شتێکم لێ‌یەوە دەسگیر دەبوو • وادەبوو لە ڕێگا ڕایدەگرتم ، بوتڵێکی فتدەکردو دەکەوتە قاورمەو پەنیر خواردن • کاتێ کە زەوقی هەبوایە ، وەك بۆ سەگ ، پارچەیەکی بۆ منیش هەڵدەدا • بەڵام هەرگیز نەیدەدایە دەستم • وای‌دادەنا ئەگەر وابکا ئەوە بۆ ئەو سووکی‌یە • بەڵام هەرچۆنێ بووبێ ئەو حاڵەم لەگەڵ حاڵم لە کامپی دیلەکانا بەراورد ناکرێ • وام‌لێ‌هات شێوەم کەمێك بێتەوە سەر شێوەی ئادەمیزاد • ڕاستە زۆر کەم ، بەڵام ئاهێکم هاتەوە بە بەردا •

دوو هەفتەیەك ئەفسەرەکەی ئاغامم لە پۆتسدامەوە دەبرد بۆ بەرلین‌و دەمگەڕاندەوە • پاشان ناردیانە نزیك ناوچەی شەڕ بۆ دروست‌کردنی هەندێ پێویستی بەرگری لەدژی هێزی خۆمان • ئیتر لەوێ خەوو خۆراسم بەجارێ لێ حەرام بوو • شەوو ڕۆژ بیرم لای هەڵاتن بوو : چۆن بگەمە لای هاوڕێکانم‌و بگەڕێمەوە بۆ نیشتمان ؟

هاتین بۆ شاری (پۆلۆتسك) • دەمەوبەیان بوو پاش دوو ساڵ بۆ یەکەمجار گوێم لە ناڵەی تۆپەکانی خۆمان بوو • براله ! دەزانیت دڵم چۆن کەوتە لێدان ؟ کە هێشتا ژنم نەهێنابوو ، یەکەمجار لەگەڵ ئیرینا یەکترمان ناسی ، ئەوەش ئەوەندە نەیخستمە دڵەکوتە • شەڕ هەشتا کیلۆمەترەیەك لە خۆرهەڵاتی پۆلۆتسکەوە بوو • ئەڵەمانەکانی ناو شار مۆن‌و تووڕە بوون • ئاغا قەڵەوەکەی منیش

له خەفەتا بەتەواوی سەری کردبوە خواردنەوە • بە ڕۆژ دەچووینە قەراغ شارو فەرمانی دەدا چیی پێویستە بۆ بەرگری دروستبکرێ• ئەویش بە تەنیا هەر دەیخواردەوە • ئازای ئەندامی هەموو ئاوسابوو • پێڵووی چاوەکانی دەتگوت تووورەکەیان پێوە شۆڕکراوەتەوە •

بیرم‌کردەوە : « چاوەڕوانی لەوە زیاتر بەکەڵك نایەت • ئەمڕۆ ئیتر ڕۆژی منە • پێویستیشە بە تەنها هەڵنەیەم • دەبێ قەڵەوەکەی ئاغاشم لەگەڵ خۆم بەرم • کەڵکی هاوڕێکانمانی پێوەیە » •

پارچە ئاسنێکی سکرابی دوو کیلۆییم دۆزی‌یەوە • بۆئەوەی ئەگەر پیامدا کێشا خوێنی لێ نەیەت ، لە پەڕۆیەکمەوە پێچا • پارچەیەك تەلی تەلەفۆنیشم لەسەر ڕێگاکە هەڵگرت • هەموو ئەوەی پێم پێویست بوو ، بە باشی ئامادەم کردو لەژێر کوشنی پێشەوەی ئۆتۆمۆبیلەکەدا شاردمنەوە • دوو ڕۆژ بەرلەوەی مالاوایی لە ئەڵەمانەکان بکەم ، دەمەو ئێوارەکە لە کار دەگەڕامەوە ، دەبینم ئەفسەرێکی ئەڵەمانی بەرێدا دەڕوات • سەرخۆش‌و چەپەڵ ، لا لە موو دەکاتەوەو ڕەت‌دەداو خۆی بە دیوارەکانەوە دەگرێتەوە• ئۆتۆمۆبیلەکەم ڕاگرت‌و بانگم‌کرد ، جلەکانیم لەبەر داکەند • ئەزانەشم هەروا خستە ژێر کوشنی ئۆتۆمۆبیلەکەوە •ئیتر بەتەواوی ئامادە بووم •

سبەینێی بیست‌ونۆی حوزەیران بوو • ئەفسەرەکەی ئاغام

فەرمانی دامێ کە بیبەم بۆ دەری شار ، بەرەو (ترۆستینتسا) • ئـەو لـەوێ سەرپەرشتـــی کردنی پێکەوەنـــانی پێویستی‌یـــەکانی بەرگری کردنی لە ئەستۆ بـوو • کەوتینـەڕێ • ئـەو لـەدواوە لەسەرخۆ کەوتە باوێشك‌دان • وەنەوز دەیبردەوە • منیش دڵـم وەختە بپچڕێ • خێرا دەڕۆیشتم • لە قەراخ شارەوە پتر پێـم بـە بەنزیندا نا • پاشان کە بەتـەواوی لـە شـار دوورکەوتینـەوە ، ئۆتۆمۆبیـلەکەم ڕاگرت • هـاتمە خـوارەوە • ئاسنـەکەم لەژێـر کوشنەکە دەرهێنا • دەرگای ئۆتۆمۆبیلـەکەم تـەواو کـردەوە • ئاغـەی قەڵەو پرخەی دەهات • دەتوت سەری لەسەر قۆڵی ژنەکەی داناوە • زرم ها ئاسنەکەم کوتا بە تەپڵی سەریـدا ، سـەری لار بوەوە • بۆ زیادە متمانە کە لە پەلوپۆم خستووە جارێکی‌تریشـم تێ‌سرەواندەوە ، بەڵام حەزم نـەکرد بیتۆپێنـم • دەمویسـت بـە زیندوویی بیگەیەنمە بەرەوە • دەبوو گەلێك شتمان بۆ باس‌بکات • دەمانچەکەیم لە کیفەکەی دەرهێناو خستمە گیرفانمەوە • تـەلی تەلەفۆنەکەشم بە کورسی‌یەکەی دوایەوە گیرکردو لە ملیم ئاڵاندو گرێ‌کوێرەیەکیشم تێ‌خست بۆئەوەی بـەملاو بەولادا نـەکەوێ ، نەوەك لە کاتی لێ‌خوڕینی خێرای ئۆتۆمۆبیلەکەدا بەربێتـەوە • بەرگە ئەفسەری‌یە ئەڵەمانی‌یەکەم لەبەرکردو ڕێـك پـێم نـا بـە بەنزیندا ، بۆ ئەو شوێنەی زەوی ناڵەی تیا لێوە دەهات •• بـۆ ئەو شوێنەی مەیدانی شەڕ بوو •



ئەڵەمانەکانی خەتی پێشەوە لێم ڕاپەڕین • ئەوانەی ناو سەنگەرەکان سەریان دەرهێنا • منیش بە ئەنقەست هێواشم کردەوە بۆ ئەوەی ببینن ئۆتۆمۆبیلەکە ئەفسەرێکی تێدایە ، بەڵام ئەوان هەر هاوار هاواریان بوو دەستیان ڕادەوەشاند گوایە بۆ ئەوێوە قەدەغەیە • وام پیشاندان کە تێنەگەیشتم • تەواو پێمنا بە بەنزینداو هەشتا کیلۆمەترەکەم هەموو قەپات کرد • کاتێ ئەوان لە مەسەلەکە گەیشتن و دەستیان کرد بە تەقە بەدوامدا ، من گەیشتبوومە خاکێکی بێلایەن ، بەڵام بەناو چاڵ و چۆڵیدا لە کەروێشك خراپتر قەڵەمبازم دەدا ••

لەپشتەوە ئەڵەمانەکان تەقەیان لێ دەکردم و ، لەپێشیشەوە کۆمەڵەکەی خۆمان کردبوومیان بە نیشانەو بە شەستیر ڕێزیان لێ دەکردم • لە چوار لاوە شووشەی پێشەوەی ئۆتۆمۆبیلەکەمیان کون کرد ، ڕادێتەرەکەیان کرد بە بێژنگ • دەریاچەیەکم بەدی کرد

چوار دەورەکەی دەوەن بوو • هینەکانی خۆیشمان بە ڕاکردن بەرەو ڕووی ئۆتۆمۆبیلەکەمان دەهاتن • خۆم‌کرد بە ناو دەوەنەکەدا • دەرگای ئۆتۆمۆبیلەکەم کردەوەو لێی داپەڕیمە خوارەوە •• باوەشم بە زەوی‌یەکەدا کردو کەوتمە ماچ‌کردنی •• هەناسە بڕکێم پێ کەوتبوو ••

کوڕێکی لاو بە بەرگی سەربازی‌یەکەیەوە کە کۆمەڵێ نیشانەی‌وای پێوە بوو هەرگیز شتی لەو بابەتەم بەرچاو نەکەوتبوو ـ خۆی گەیاندە سەرم • ددانی لێ جیڕکردمەوەو شیڕاندی بەسەرما : « ها ئەفسەرە چەپەڵەکان ! ڕێتان هەڵەکردوە ؟ » • جلە ئەفسەری‌یە ئەڵەمانی‌یەکەم لەبەرم داماڵی‌و نیشانەکانیم خستە ژێر پێ‌و پێم‌گوت : « قوربان ! ڕۆڵەی شیرینم منێکی فەرۆنیژیی ڕەسەن ، چۆن بە ئەڵەمانم تێدەگەی ! جارێ ئەو بەرازە بکەنەوە کە لە ئۆتۆمۆبیلەکەدا بەستوومەتەوە ، جانتاکەی بێنن‌و منیش بگەیەننە لای قوماندانەکەتان •

دەمانچەکەمم دانێ • لەم دەستەوە دەدرام بەو دەست • نزیکی ئێوارە بوو خۆم لە بەردەم ئەفسەری قوماندانی تیپەکەدا بینی‌یەوە • بەر لەوە تێروبڕیان دەرخوارد دام ، بردمیانە گەرماو ، بەرگی نوێیان بۆ هێنام • بەوچەشنە ، وەك باوە ، بە لەشی خاوێن‌و بەرگی ڕێکوپێکەوە ، چوومە بارەگای قوماندان • قوماندان لەپشت مێزەکەیەوە لەبەرم‌هەستاو بەرەو پیرم هات • لەپێش چاوی هەموو ئەفسەرەکاندا باوەشی پێدا کردم‌و گوتی : «سوپاس بۆ تۆی سەرباز،

بۆ ئەو دیاری‌یە بەنرخەی لای ئەڵەمانەکانەوە بۆت‌هێناوین • ئـەو ئەفسەرەی تۆو جـانتاکەی دەستی لـە بیسـت بەدیل‌گیراو بۆ ئێمە بەنرخترن • ڕاپۆرتێك لەم‌بارەوە بۆ فەرماندەیەتیمان دەنووسـم‌و پێشنیاریشی تیا دەکەم خەڵاتی دەوڵەتت بدەنێ • ئەو وشە ناسکانەی قوماندان قوڕگیان پڕکـردم لە قوڵپی گریـان • لێوەکانم کەوتـە لەرەلەر • تەنها ئەوەندەم پێ کرا کە بڵێم : « هاوڕێی قوماندان ! تکات لێ دەکەم لە هێزی.پیادەم دابنێ » •

قوماندان پێکەنی‌و دەستی خستە سـەر شانم • گوتی : «تۆیەك کە بە هەزار حاڵ دەتوانی بەپێوە بوەسـتی ، شـەڕت لەکوێ پـێ دەکرێ ؟ هەر ئەمڕۆ ڕەوانەی نەخۆشخانەت دەکەم • لەوێ جارێ تیمارت دەکەن ، تێرت دەکەن ، پاش ئەوەش پشـووی مانـگێکت دەدەنێ ، دەچیتەوە بۆ لای ماڵ‌و منداڵەکەت • کە گەڕایتەوە لامان ، ئەوسا بڕیار دەدەین لەکوێت دابنێین » •

قوماندان‌و تێکڕای ئەفسەرەکانی بارەگا بە دڵ دەستیان گوشیم‌و بە گەرمی خوا حافیزی‌یان لێ کردم • کە چوومە دەرێ تـەواو هەستم بە تێکشکاوی‌و بێ‌هێزیی خۆم کرد ، چونکە لە ماوەی دوو ساڵی ڕەبەقدا قسەی خۆش‌و مرۆڤانەم نەبیستبوو • براله ! سەیـر ئەوەیە تا ماوەیەکی زۆریش کە قسەم لەگەڵ هەر فەرماندەرێکدا دەکرد لێم بووبوو بە خوو بێ‌ئەوەی ئاگام لە خۆم بێ هەردەم شانم هەڵدەبڕی‌و سەرمم لەنێوانیاندا دەشاردەوە ، وەك بڵێی ترسی ئەوەم

بێ لێم‌بدەن • سەیرکە ، لە دیلخانەی فاشیستەکاندا فێری چی‌یان کردبووین •

لە نەخۆشخانەوە یەکسەر نامەیەکم بۆ ئیرینا نووسی• بەکورتی باسی هەموو شتێکم بـۆ گێڕایـەوە • لە دیلیـدا چەردو ئازارێـکم چێشتبوو ، چۆن هەلاتمو چۆن ئەفسەرێکی ئەلەمانیشم لەگەل خۆم هەلگرت •• پێم‌بلێ ئەو خۆهەلکێشانە مندالانەیە لەکوێوە هات • خۆم پێ ڕاگیر نەکرا • خەبەری ئەوەشم‌دایە کە قوماندان بەلێنی داوەمەتێ داوای خەلاتم بۆ بکات ••

دوو هەفتە هەر دەنووستمو دەمخوارد • پزیشك ڕێی هەمـوو جۆرە خواردنێکی نەدابووم ، بۆیە خواردنی تایبەتی‌یان دەدامێ • هێزم هاتەوە بەبەردا • پاش دوو هەفتـە ئیتر دلـم گیرا • هیچـی نەدەبردو نەمدەتوانی هیچ بخۆم• لە مالەوە وەلام نەبوو • نایشارمەوە ماتەمینی دایگرتم • خواردنم هەر نەمابوو • خەوم لێ حەرام بووبوو• هەزار خەیالی سەیر بەدەوری مێشکمدا خـولی دەخـوارد •• لـە هەفتەی سێهەمدا لە ڤەرۆنیژەوە نامەیەکم بۆ هات ، بەلام ئیرینـــا نەینووسیبوو، (ئیڤان تیمۆفێیڤیچ)ی دارتاشی دراوسێمان نووسیبووی• خوا نەکا کەس نامەی‌وای بۆ بێت • ئیڤان بۆی نووسیبووم کەوا هەر لـە حوزەیرانـی چـلو دوودا ئەلەمانەکان کارگـەی فڕۆکەکەیان بۆردمان‌کردو بۆمبایەکی گەورەش بەر خـانوەکەی ئێمە کەوتبوو • ئیریناو کچەکان لەوکاتەدا لە مالەوە بووبوون •• ئیڤان نووسـیبووی پرزۆلیان لێ نەدۆزرایەوە ، لەجێی خانوەکەشمدا چالێکی قوول یەیدا

بوو •• نامەکەم تا کۆتایی بۆ نەخوێندرایەوە • بەرچاوم تاریـك بوو ، دڵم گوشراو گیراو ئیتر نەکرایـەوە • لەسـەر قەرەوێڵەکەم درێـژ بـووم • تۆزێـك ڕاکشام •• پاشان هەستامـەوە نامەکەم تەواوکرد • ئیڤانی دراوسێمان نووسیبووی ئەنەتۆلیی کوڕم لەکاتـی بۆردومانەکەدا لە شار بوو ، ئێوارە کە گەڕایەوە گوندو چاڵەکەی دی ، نەمایەوە • هەر بەوشەوە چوەوە بۆ شار • بەر لە ڕۆیشتنی بە منی دراوسێی گوت : دەچم داوا دەکەم لەسەر ئارەزووی خـۆم بمکەن بە سەربازو بمنێرن بۆ مەیدانی شەڕ • ئەمەو هیچیتر ••

کە دڵم بەربوو هاژەی خوێن لە گوێمدا دەهات • هاتەوە بیرم کە چۆن ئیرینام لە وێستگەی شەفەندەفەرەکەدا بە هەزار مەینەت لێ جیا بووەوە •• دیارە هەر ئەوکاتە دڵی ئافرەتانەی خەبەری دابوویە کەوا جارێکیتر لەم دنیایەدا چاومان بە یەکـتر ناکەوێتەوە، کەچی من ئەوکاتە پاڵم پێوەناو بە زۆر لە خۆمم دوورخستەوە •• ماڵو منداڵی خۆمم هەبوو • بە مەینەتی ساڵەها بۆم پێکەوە نرابوو ، بەڵام لـە چاوتروکاندنێکدا هەموویم لەکیس چوو • بیرم کردەوە •• لە دڵی خۆمدا گوتم : ئیتر وا بێ کەسو بێدەر بەتەنیا بۆ خۆم مامەوە • تـۆ بڵێی ئەم ژیانە سەختەم خەو نەبێ ؟ • خۆ من کاتێ کە دیل بووم هەموو شەوێ لەبەرخۆمەوە قسەم لەگەڵ ئیریناو منداڵەکان دەکرد • هێزم دەدانەبەر ، ورەیانم بەرزدەکردەوە • پێمدەگوتن خەمم بـۆ نەخۆن • دەمگوت « دەگەڕێمەوە بۆ ناوتان • من بەهێزم•• لە مردن

نایەم •• سەرلەنوێ پێکرا یەکدەگرینەوە » • دیارە کەواتە مـن ئەو دوو ساڵە لەگەڵ مردووان دەدوام •

کابرا کە سەرگوزەشتەکەی خۆیی بۆ دەگـێڕامەوە ، تاوێـك بێدەنگ بوو • دوایی بە دەنگێکی کپی پچڕ پچڕ گوتی :

ـ براله ! با جگەرەیەك بکێشین • من وا خەریکە دەخنکێم • سەرو جـگەرەمان کێشا • لـە دارستانـی نقومبـووی ناو ئاوەکەدا دارکوتکەرەیەك بە دەنووك تەقەتـەق لە دارێـکی دەدا • شەماڵـی تین‌تێکەوتـوو گـوارەی وشـکی گوێی درەخـەکانـی خـاو دەلەراندەوە • تەم‌و مژیش ڕووی زەویی شاردبووەوە • قەتارەی هەوری ڕەش‌و سپی بەئاسمانەوە دەدرەوشانەوە • دنیای بێبـار لەو دەمە بێدەنگە ماتەماوی‌یەدا خەریکی خـۆ ئامـادە کـردن بوو بـۆ پێشوازی لێ کردنی بەهاری مەزن ، بۆ پێ‌سەلماندنی سەرکەوتـنی هەمیشەیی زیندوێتی لە ژیاندا •

بێدەنگی زەحمەت‌بوو • لێم پرسی :

ـ ئەی پاشان چۆن ؟

بـە نەبـەدڵ دەستی‌کردەوە بـــە گێڕانـەوەی پاشـماوەی سەرگوزەشتەکەی :

ـ پاشان چۆن ؟ پشووی مانگێکم لە قوماندان وەرگرت • پاش هەفتەیەك گەیشتمەوە ڤەرۆنێژ • کوتەکوت بە پێ کوتام تا گەیشتمە

ئەو شوێنەی ژیانی خێزانیم تێدا بردبوە سەر : چاڵێکی قووڵ ، پڕ لە ئاوێکی ژەنگاوی ، چوار دەوری تا ناوقەد دڕكو قامیشەڵان .. بێدەنگی یەکی خامۆش باڵی بەسەردا کێشابوو ، دەتگوت لە گۆڕستاندای . ئاخ ، براله ! مەسەلەکە ئاسان نەبوو بۆم . تاوێك لەوشوێنەدا ڕاوەستام . خەمو پەژارە دڵمی داگرتبوو . نەمتوانی لە تاقە سەعاتێك زیاتر تێدا بمێنمەوە . هەر لەوێوە گەڕامەوە بۆ وێستگەی شەمەندەفەرو هەر ئەو ڕۆژە گەڕامەوە بۆ ناو تیپەکەم .

پاش سێ مانگ تیشکی خۆشی لێی‌دام ، وەك خۆر لە گۆشەی هەوری سیاوە سەردەربێنێ .. ئەنەتۆلیی کوڕمم دۆزی‌یەوە . لە ناوچەیەکی‌تری شەڕەوە نامەیەکی بۆ ناردم . لە ڕێگای ( ئیڤان تیمۆڤیێڤیچ )ی دراوسێمانەوە ناوو نیشانمی زانیبوو . لە سەرەتادا لە ئامۆژگای تۆپچێتی پێ‌یان‌خوێندبوو . پاش ساڵێك بە پلەی هەڵاوێردە ئامۆژگاکەی تەواو کردبوو ، لەوێوە ناردبوویان بۆ ناوچەی شەڕو ئەوەتە لەوێشەوە نامەی بۆ نووسیوم کەوا پلەی کاپیتانیان داوەتێو قوماندانی لقی چلو پێنجە . شەش مەدالیاو خەڵاتی هەیە . لە هەموو سەرێکەوە پێش دایكو باوکی خۆی کەوتبوو . زۆرم شانازی بەوەوە دەکرد . سەرلەنوێ خۆشیی خستەوە دڵم . چۆن شانازیی پێوە نەکەم . کوڕی من کاپیتانو قوماندانی لق بێ ، ئەمە گاڵتە نی‌یە . سەرەڕای ئەوە ئەو هەموو مەدالیانەشی هەبێ . قەی‌ناکا باوکی شۆفێری لۆری‌یەو بۆمباو شتومەکی‌تری جەنگی دەگوێزێتەوە . ئەو بەراوردی لەگەڵ باوکی

بێ ناکرێ • باوکی تازە لێبوەتەوە ، بەڵام ئەوی کاپیتان دواڕۆژی ڕوونـاکە •

شەوان دەکەوتمە خەیاڵو ئاواتی پیرەمێردانە : لە دڵی خۆمـدا دەمگوت : کە شەڕ تەواو بوو ، ژن بۆ کوڕەکەم دێنمو خۆیشم لـە پەنای ژنو مێردی لاودا دەژیم • ئاگام لە منداڵەکانیان دەبێ • وردە وردەیـەکیش خەریـکی دارتاشییەکەی خۆم دەبم • یـەك پـارچە خەیاڵاتی پیرەمێردانە لە کەللەی دابـووم ، بـەڵام ئەمـەش زۆری نەخایاند • سەرلەنوێ ماتەمینی باڵی بەسەرمدا کێشایـەوە • بـە درێژاییی زستـان بێپشوو هەر لە هەڵمەتو هێرش بردنـدا بووین بۆ پێشەوە • فریانەدەکەوتین زووزوو نامە بۆ یەکتری بنووسـین • بەڵام کە شەڕ نزیکی کۆتایی هاتن بوەوەو گەیشتینە دەوروبـەری بەرلین سەرلەبەیانییەك نامەیەکم بۆ ئەنەتۆلی نارد • پاش ڕۆژێـك وەڵامم پێگەیشتەوە • یەکسەر تێگەیشتم کەوا هەرچەند خـۆمو کوڕەکەم هەریەکە لە قۆڵێکەوە هاتووینەتە سەر پێتەختی ئەڵەمانیا ، بەڵام لەیەکەوە نزیکین • لەکاتێکا کە زۆر بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەوساتە بووم کە چاومان بە یەك دەکەوێتەوەو یەکدی دەبینینەوە ، سبەینێی ڕۆژی نۆی مایس ، ڕۆژی سەرکەوتن ئەنەتۆلیی کوڕم بوو بە گوللەی کەمینگرێکی ئەڵەمانییەوەو کوژرا ••

پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە فەرماندەی بەتالیۆنەکەمان بانگی کردم• دیم ئەفسەرێکی تۆپچیی لا دانیشتبوو • من نەمدەناسی • چوومـە ژوورەکەی • لەبەرم ڕاستبوەوە ، وەك بڵێی لەبەر ئەفسەرێکی لـە

خۆی گەورەتر هەڵدەستێ • فەرمـاندەی بەتالیۆنـەکەمان گوتـی : « فەرموو سۆکۆلۆف ! » و یەکسەر ڕووی بۆ لای پەنجـەرەکەوە وەرگێڕا • لەوکاتەدا وام هەسـتکرد کـەوا کارەبـا گرتمـی • لەخۆمەوە هات بە دڵمدا کەوا شتێك ڕووی‌داوە • ئەفسەرە میوانەکە هات بەلامەوەو وەك بەگوێمدا بچپێنێ بە دەنگـێکی کـپ گـوتی : « باوکی مەرد ! کاپیتان سۆکۆلۆڤی کوڕت ئەمڕۆ بەسەر تۆپەکەیەوە کوژرا • فەرموو لەگەڵم ! » •

هۆشم لای خۆم نەما ، بەڵام توانیشم خۆم ڕاگیر بکەم • ئێستا ئەو ساتەم وەك خەو دێتەوە بەرچاو کە لەگەڵ ئەفسەرەکە بەسواریی ئۆتۆمۆبیلێکی گەورە بە شەقامی هەڵتەکاودا دەڕۆیشتین • تاپۆیەك دێتەوە بەرچاوم ، سەرباز ڕیز بووبوون ، تابووتێـك لـە قەیفـەی سوورەوە پێچرابوو • ئاخ ، کوڕە نازدارەکەم ! چۆنم دیتیەوە ؟

چوومە لای تابووتەکەوە ، کوڕەکەمی تێدا ڕاکشابوو • لەویش نەدەچوو • کوڕەکەی من هەمیشە دەم بە پێکەنین بوو • منداڵ ، ناوشان تەسك ، ملباریك •• کەچی ئەوەی ناو تابووتەکە لاوێـکی چوارشانە ، پیاوێکی قۆز ، چاوەکانی بەتەواوی نەنووقاندبوو ، وەك بڵێی بۆ شوێنێکی دوور بڕوانێ •• تەنیا لە سووچی لێوەکانیدا ، لـە پێڵووی چاوەکانیدا ڕەنگی منداڵەکەی جاران مابوو کە من گیرۆدەی خۆشەویستیی بووبووم •• ماچم‌کردو کشامە دواوە • ئەفسەرێـك وتاری‌دەدا • هاوڕێیانی کوڕەکەم چاویان دەسڕی • بەڵام تنۆکە

فرمێسکە نەهاتوە خوارەکانی من ، وا دیاربوو بەسەر دڵمەوە وشك بووبوونەوە . دەبێ وابێ ، بۆیە دڵم هێندە ژاندەکا !

لە غەریبی ، لە خاکی ئەڵەمانیای بیانیدا دوا هیواو دوا ئاواتی خۆم خستە چاڵ . تیپەکەی کورەکەم ماڵئازاییی یەکجارییان لە فەرماندەکەیان کرد . منیش وەك پارچەیەك لە لەشم بووبێتەوە وابوو .. بێهوش و خەفەتبار گەڕامەوە بۆ تیپەکەی خۆم .. زۆری پێنەچوو بەرەڵایان کردم لە لەشکر . بۆ کوێ بچم ؟ قابیلە بچمەوە بۆ ڤەرۆنیز ؟ بە هیچ جۆرێ ناچمەوە ئەوێ . ئەی چی بکەم ؟ کەوتەوە بیرم کەوا هاوڕێیەکم هەیە لە (ئوورێووپینسك) زستانی ڕابوردوو بریندارکرابوو ، لەبەرئەوە بەرەڵایان کردبوو لە لەشکر . ئەو هاوڕێیەم کاتی خۆی پێی گوتبووم بچمە لای ئەو . ئەوەم بیرکەوتەوەو چووم بۆ ئوورێووپینسك .

هاوڕێکەم و ژنەکەی منداڵیان نەبوو . لە خانووی خۆیاندا دەژیان . خانوەکەیان کەوتبوە پەڕی شارەوە . هەرچەندە ئەو ماگانەی پەككەوتەیی وەردەگرت ، لە کارگەش شۆفێریی دەکرد . منیش هەر لەوێ دامەزرام . لە ماڵی هاوڕێکەم نیشتەجێ بووم . باش خزمەتیان دەکردم . هەموو جۆرە بارێکم دەگواستەوە . ئەوە بۆم بووە هۆی بینینی زۆر ناوچەی جیا جیا . پایزێ ناردیانینە سەر کاری گواستنەوەی خەرمانەکەنم . لەوەدەمەدا لەگەڵ کوڕە نوێکەم یەکترمان ناسی .. لەگەڵ ئا ئەوە کە لەو ناو خۆڵەدا یاری دەکات .

ڕێ‌دەکەوت کە لە کار دەگەڕایەوە بۆ شار خۆت دەکرد بە چێشتخانەیەکدا ، هەرشتێك دەسگیر بوایە لەبرسانا دەتخوارد • بێ‌گومان من پێکێکیشم بۆ حەسانەوە بەسەریدا هەڵدەقوڕاند • بەتەواوی خووم بەمەوە گرتبوو • جارێکیان ئەو منداڵەم لای چێشتخانەکەدا بینی • بۆ سبەینێ‌یش دیسانەوە چاوم پێی کەوتەوە • جلێکی شڕو دڕاوی لەبەردابوو • دەمو چاوی بە شووتی سواغ درابوو • تۆزو خۆڵی دنیای لێ نیشتبوو • سیاچارە ، بەڵام چاوەکانی وەك ئەستێرەی شەوی پاش باران دەدرەوشانەوە •• خۆشەویستیی ئەو منداڵەم هێندە کەوتە دڵ ، وام‌لێ‌هات کە لەسەر کار دەکەوتەوە بیرم پەلەم پێ دەکەوت کە زوو بگەڕێمەوە تا چاوم پێی بکەوێتەوە • بەوە تێر دەکرا کە هەریەکێ لە چێشتخانەکە شتێکی بخواردایە ، پاروویەکی دەدایە •

ڕۆژی چوارەم یەکسەر لە سەفخۆزەوە بە بارە گەنمەوە هاتمە بەر چێشتخانەکە • منداڵۆچکەکەم لەوێ بوو ، لەسەر پێ‌پێلکەی چێشتخانەکە دانیشتبوو قاچەکانی شۆڕ کردبووەوە ، لەوە دەچوو برسیی بێ • لە پەنجەرەی ئۆتۆمۆبیلەکەوە سەرم دەرهێنا • هاوارم لێ کرد : « ڤانیا هۆو ! خێراکە ، وەرە سوار بە• بەم لۆرییە دەچینە سەر خەرمانو پاشان دێینەوە بۆ ئێرە ، نان دەخوێن » • لە بانگ‌کردنەکەی من ڕاچڵەکی • لەسەر پێ‌پیلکەکەوە بازی دایە خوارەوەو لەسەرخۆ گوتی : « مامە ! چۆن دەزانی ناوم ڤانیایە ؟ » چاوەکانی گەش دەدرەوشانەوە • چاوەڕوانی دەکرد وەلامی

بەدەمەوە • پێم‌گوت : « من مرۆڤێکی دینـا دیـدەم‌و هەمووشتێـك دەزانم » •

هاتە لای دیوی ڕاستەوە • دەرگاکەم بۆ کردەوە • لەتەنیشت خۆمەوە دامنا • تۆتۆمۆبیلەکەم خستەوە گەڕ • منداڵێکی هێندە چالاك، کەچی لەپڕ مات‌و بێدەنگ بوو • کەوتە دەریای خەیاڵەوە • لەژێـر برژانگە درێژەکانیەوە تەماشای دەکردم‌و هەناسەی هەڵدەکێشا • بۆ دەبێ ئەو باڵندە خنجیلانەیە وا زوو فێری هەناسە هەڵکێشان بێ ؟ ئایا ئەمە کاری ئەوە • لێم‌پرسی :

ـ « ڤانیا ! باوکت لەکوێیە ؟ »

لە وەڵامدا بەئاستەم گوتی :

ـ « لە شەڕدا کوژرا » •

ـ « ئەی دایکت ؟ »

ـ « لە شەمەندەفەردا بووین بۆمبای بەرکەوت » •

ـ « لەکوێوە بۆ کوێ دەچوون ؟ » •

ـ « نازانم ، بیرم نی‌یە » •

ـ « ئەی لێرە هیچ خزم‌و کەست نی‌یە ؟ » •

ـ « کەس ! » •

ـ « شەو لەکوێ دەنوی ؟ » •

ـ « هەرکوێ بە نسیب بوو » .

فرمێسکی تاڵم هاتە کوڵ . بێ سێو دوو بڕیارمدا : « ناهێڵم ئەم بەرخۆلەیە بێ کەس لەناوبچێ . دەیکەمە کوڕی خۆم » . فێنکی‌یەك دای لە دڵمو گەشامەوە . ڕووم تێ کردو بە دەنگێکی ناسك لێم‌پرسی :

ـ « ڤانیا ! تۆ دەزانی من کێم ؟ »

هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی :

ـ « کێی ؟ »

هەر بەو ناسکی‌یە پێم گوت :

ـ « من باوکتم » .

خوایە ! ئەمە چی‌یە ڕوودەدا ؟ خۆی هەڵدایە سەر سنگم . دەستی کردە ملم . کەوتە ماچ کردنی ڕوومەتەکانم ، لێوەکانمو ناوچاوانم . وەك سیسرگ دەیسیراند . ناسك دەیقیژاند : « بابە گیان ! دەمزانی ! دەمزانی دەمدۆزیتەوە .. هەر دەمدۆزیتەوە. من زۆرم چاوەڕوانی کردی کەی دەمدۆزیتەوە ؟ » باوەشی پێدا کردبووم . وەك شۆڕەبی لەبەر ڕەشەبادا دەلەرزی . منیش بەرچاوم تاریك بوو . گیانیشم هەموو دەلەرزی . دەستم سوکانی ئۆتۆمۆبیلەکەی نەدەگرت . نازانم چۆنم لەوکاتەدا لە دەست بەرنەبوو ؟ بەڕاستی خۆم سەرسامم . بە ڕێکەوت ماتۆڕی

ئۆتۆمۆبیلەکەم لە ئاوی کەنار شەقامەکەدا کوژایەوە • تا تاریکاییی بەری چاوم ڕوون نەبوەوە ترسام لێبخوڕم ، نەوەك یەکێك بکەم بەژێرەوە • ئاوا پێنج دەقیقەیەك وەستام • کوڕەکەم بە هەموو هێزی هەر باوەشی پێدا کردبووم • دەنگی ئێوە نەدەهات • ڕاچڵەکی • دەستی ڕاستم کردە ملیو بە خۆممەوە نووساند • بە دەستی چەپیشم سوکانەکەم وەرگێڕا ، بەرەو ماڵی خۆمان لێمخوڕی • هەموو ئیش‌وکارم خستە ئەولاوە •

ئۆتۆمۆبیلەکەم لەنزیك دەرگای ماڵەوە ڕاگرت • ئازە کوڕەکەمم کردە باوەش‌و بردمە ژوورەوە • بەجۆرێ بە دەستە وردیلەکانی باوەشی بە ملمدا کردبوو ، تا ژووری ژوورەوە بەری‌نەدا • ڕوومەتی خستبوە سەر ڕیشە زبرە نەتاشراوەکەم • ئا بەو شێوەیە بردمە ژوورەوە • ژن‌و پیاوەی خاوەن ماڵ لە ماڵ بوون • کە چوومە ژوورەوە چاوێکم لێ داگرتن‌و جا گورج بە گەرم‌و گوڕی‌یەکەوە گوتم : « دڵ‌و دەروون فراوانینە ! بەپیرمانەوە بێن ! » • هیچ‌کامیان منالی نەبوو ، یەکسەر تێگەیشتن مەسەلە چی‌یە • هەستانە سەر پێ بەرەو پیرمان هاتن • فانیا بە هیچ کلۆجێك ئیم‌نەدەبوەوە ، بەلام ئاخری هەرچۆنێ بوو ڕازیم‌کرد لە باوەشم بێتە خوار • دەستەکانیم بە صابوون شت ، لەسەر کورسی‌یەك دامنا • ژنەی خاوەن‌ماڵ قاپێ شۆربای بۆ تێ‌کرد • کە بینی چۆن لەبرساندا هەڵی‌قوڕاند ، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك بۆی • ئەو لای زۆپاکەوە وەستابوو بە بەرهەڵبێنەکەی چاوی دەسڕی • ڤانیای من کە ژنەکەی دی



دەگری ، ڕای کرد بەلایەوە ، پێی گوت : « پووری ! بۆچی دەگریت؟ باوکم لای چێشتخانەکەوە دۆزیمیەوە • دەبوو هەموو شادمان بن ، کەچی تۆ دەگریت ؟ » بەلام ژنە پتر فرمێسکی هەلڕشت •• بەرهەلبێنەکەی هەموو تەڕ بوو •

پاش نانخواردنی نیوەڕۆ کوڕەکەمم بردە سەرناشخانە سەریمتاشی • خۆم لە مالەوە نامە تەشتێکو شتم • خاولییەکی پاکم

پێوە پێچا • ئەو وا باوەشی پێدا کردبووم هەر بەسەر دەستمەوە خەوی لێ کەوت • بە هێواشی لەسەر قەرەوێڵەکە پاڵم خستو گەڕامەوە بۆ سەر کارو دەستم کرد بە گەنم بارکردن • ئۆتۆمۆبیلەکەم لای عەمارەکەوە ڕاگرتو بە ڕاکردن چووم بۆ بازاڕ ، بە پەلە پانتۆڵێکی خوری ، کراس ، بلووز ، پێڵاوم بۆ کڕی ، هەرچەند ئەوانەی من کڕیمن بۆی هەموویان بۆ ئەو گەورە بوونو جۆرێکی باشیش نەبوون ، تەنانەت ژنەی خانەخوێم لەسەر پانتۆڵەکە بەگژما هاتو گوتی : « کابرا تۆ دەڵێی شێت بووی • پانتۆڵی خوری بەم گەرمایە چۆن دەکرێتە بەری منداڵ ؟ » و یەکسەر هەڵسا مەکینەی دروومانەکەی نایە سەر مێزەکەیو پارچەیەك کوودەریی لە سنووقێك دەرهێناو دوای سەعاتێك کراسێکی قۆڵ کورتو دەرپێیەکی بۆ تەواوکرد •

شەو لە تەنیشتیەوە پاڵ کەوتمو بۆ یەکەمجار لەو ماوە دوورو درێژەدا خەوێکی خۆشم کرد ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوشەوە چوار جارێك هەڵستام • خەبەرم دەبوەوە ، دەمبینی لە بن باخەڵما وەك چۆلەکە لە بن باڵی دایکیدا مشە مشی بوو • بەڕادەیەك شادمان بووم لە گوتن نایەت • نەدەجووڵامەوەو نقەم لە خۆم بڕیبوو نەوەك خەبەری بێتەوە ، بەڵام زۆر خۆمم پێ نەگیرا • لەسەرخۆ هەستام ، شقارتەیەکم داگیرساند • هەرچەندم تەماشا دەکرد ، تێرم لێ نەدەخوارد •

پێش شەبەق هەڵستام • تێناگەم هیی چی بوو هەناسەم سوار بووبوو ؟ کوڕەکەم چەرچەفەکەی بەسەرەوە نەمابوو • لەسەر

پانایی قەرەوێڵەکە پاڵکەوتبوو • قاچەکانی درێژکردبوو خستبوونیە سەر ملم • نووستن لەگەڵیدا زەحمەت بوو ، بەڵام من لەگەڵی ڕاهاتبووم‌و بێ‌ئەو نەمدەکرا • شەوان تەماشام دەکرد نووستووە ، بۆنی قژیم دەکرد • خەم‌و پەژارە دڵی کردبووم بە بەرد ، بەڵام بە دیتنی ئەو دڵم نەرم دەبووەوە •

لە سەرەتادا کە دەچووم بۆ کار لەگەڵ خۆم دەمبردو لە ئۆتۆمۆبیلەکەدا لەتەنیشت خۆمەوە دامدەنا • دوایی تێگەیشتم ئەمە ناکرێ • من خۆم بەتەنیا چیم‌دەوێ ؟ نان‌و پیازێکم بەسەو سەرباز تا ئێوارە هەر تێرە • بەڵام ئەو بەجۆرێکی‌کەیە • ئەو پێویستی بە شیرە ، پێویستی بە هێلکەیە • نابێ بێ شۆرباو بێ چێشتی گەرم بێ • ئەوشتانەش لەسەر کارەکەی من دەست ناکەون • ناچار بووم بە ڕۆژ لای ژنەی خاوەن ماڵ بەجێم‌دەهێشت • هەرچەند ئەوە بۆ من زەحمەت بوو ، بەڵام خۆم پێوە ڕاهێنا • ئەویش لە ماڵەوە تا ئێوارە دەگریا ، ئێوارانیش دەهاتە سەر ڕێ‌و چاوەڕوانی دەکردم ، تا درەنگانێك لەسەرم ڕادەوەستا •

لەسەرەتادا گەلێ زەحمەتم بەهۆیەوە تووش دەبوو • جارێکیان لەبەرئەوەی بە ڕۆژ زۆر ماندوو بووبووم ، هێشتا دنیا ڕووناك بوو پاڵکەوتین بنوین • ئەو لەژێر لێوەوە لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد • دەتگوت چۆلەکەیە جریوە جریویەتی • لەپڕ بێ‌دەنگ بوو • لێم پرسی :

ـ « ڕۆڵە ! ئەوە بیر لە چی دەکەیتەوە ؟ »

سەیرێکی بنمیچەکەی کردو ئەویش لە منی پرسی :

ـ « بابە ! ئەوە تۆ پاڵتۆ چەرمەکەت چی لێ کرد ؟ »

من لە هەموو ژیانمدا پاڵتۆی چەرمم نەبوە • ناچار بووم بەپێی پێویست وەڵامی بدەمەوە :

ـ « لە ڤەرۆنیژ بەجێم‌هێشت » •

لێی‌پرسیمەوە :

ـ « بابە ، ئەوە تۆ بۆچی ئەوەندە زۆر بەدوامدا گەڕایت ؟» •

ـ « ئاخر کوڕم من لە ئەڵەمانیا ، لە پۆڵۆنیا ، لە هەموو وڵاتی بێڵە ڕووسیادا بەدواتدا دەگەڕام ، تۆ هەر نەبـووی ، کەچـی لـە ئووریووپینسك دۆزیمیتەوە » •

ـ « بۆ کامیان نزیکترن : ئووریووپینسك یا ئەڵەمانیا ؟ ئـەی پۆڵۆنیا لە ماڵی خۆمانەوە دوورە ؟ »

بەر لە نووستن ئەم جۆرە قسانەمان بۆ خۆمان دەکرد •

براله ! ڕەنگێ بێ تۆ لاتوابێ لەخۆڕایی ئەو پرسیارەی لەبارەی پاڵتۆ چەرمەکەوە کردبێ • وا نی‌یـە • پرسیـارەکەی لەخۆڕایـی نەبوو • ئەو پرسیارەی نیشانەی ئەوە بوو کە باوکی ڕاستەقینەی پاڵتۆیەکی‌وای بووەو ئەمیش لەبەریا بینیوبەتی • بیری منداڵ وەك

شەبەقی هاوینان وایە • دەردەکەویّو لە ماوەیەکی کەمدا دنیـــا هەموو ڕووناك دەکاتەوەو ئیتر نامێنیّ • بیری ڤانیاش وەك شـەبەقی هاوینە لەپڕ کاردەکات •

لەوانەبوو ساڵیکی‌کەش لە ئووریووپینسك بژیایایە لەگەڵ ئەو ماڵە ، بەڵام لە تەشرینی دووهەما تووشی بەڵایەك بووم : بەنـاو گوندیکا تیدەپەڕیم ، شەقامەکەی قوڕو لیتە بوو ، ئۆتۆمۆبیلەکەم خلیسکا • لەوکاتەدا مانگایەك خەریك بوو دەپەڕی‌یەوە ، بـەر ئۆتۆمۆبیلەکە کەوت‌و گلا • خۆت دەزانی لە حاڵی‌وادا ژنان دەکەونە قیژە قیژ • خەڵك کۆبوونەوە • بەڕیوەبەری گـوزەر پەیدابـوو • یەکسەر ڕوخسەت‌نامەی شۆفیری‌یەکەی لیّ سەندمەوە• چەندم داوا لیّ کردو لیی پاڕامەوە سـوودی نەبـوو • مانـگاکە ڕاست‌بوەوە • کلکیکی ڕاوەشاندو ڕۆیی • منیش بیّ ڕوخسەت‌نامەی شۆفیری مامەوە • زستانیّ دارتاشیم کرد • دوایی نامەم بۆ هاوڕیّیەکـی سەردەمی سەربازیم نارد کە لە ناوچەی ئیوە لە هەریمی ( کاشـار ) شۆفیری دەکا • وەڵامی دامەوە • بانگی‌کردم بۆ لای خۆیان • بۆی نووسیوم وەرە ، لیرە شەش مانگیّ دارتاشی دەکەیت‌و دوایـی ڕوخسەت نامەیەکی نوییی شۆفیریت دەدەنیّ • ئەوەتە ئیستا لەگەڵ کوڕەکەم بە پـیّ کەوتووینەتە ڕیّ بۆ کاشار دەچین •

خـۆ ئەگەر ئـەو مەسەلەی مانـگایەش ڕووی‌نەدایە هـەر ئووریووپینسکم بەجیّ‌دەهیشت • خەفەت ناهیڵیّ ماوەیەکی دریـژ لە هیچ شوینیکدا ئۆقرە بگرم • کە ڤانیام گەورە بوو کاتی ئەوەی

هات بچێتە قوتابخانە ، ئەوسا ناچار دەبم لە شوێنـێك بەیەکجاری نیشتەجێ ببم • ئێستا جارێ پێکەوە ڕووسیا دەگەڕێین •

گوتم : بەڵام لەوانەیە ئەو بە پێ ڕۆیشتنە بۆ ئەو زەحمەت بـێ •

ـ ئەو کەم بە پێ دەڕوات • زیاتر من هەڵی دەگرم • دەیکەمە قەڵاندۆشکانم‌و دەڕۆم • کە ئارەزووشی کرد دایدەگرم‌و لەســەر زەوی دایدەنێم • دەستدەکا بە ڕاکردن ، بازدەدا ، وەك کــارو بەرخ هەڵدەقونێ • براله ! ئەمە هەمووی هیچ نی‌یە • من بـیر لەوە دەکەمەوە کە تا سەر بۆی نامێنم • ئەوەتە ڤیچقەکانی دڵم لـە کەڵـك کەوتــوون‌و پێویستیان بە گۆڕینـە • جاری‌وا هەیە دڵـم بەجۆرێك دەگوشرێ ڕۆژی ڕوونـم لەپێش چـاو تاریكدادێ • دەترسم جارێکیان بەدەم خەوەوە بمرم ، کوڕەکەم خەبەری ببێتــەوە خـــۆی لـە بـاوەشی مردوویـەکدا ببینـێ‌و زەندەقـی بچێ • نەگبەتی‌یەکی‌تریش لـــەولاوە : زۆربـەی شـــەوەکان مـردووە خۆشەویستەکانم لە خەودا دەبینم • بە زۆری خۆم لەناو تەلبەندێکی دڕکاویدا دەبینم‌و ئەوانیش لەودیوەوە بە ئازادی • لەبارەی هەموو شتێکەوە لەگەڵ ئیریناو منداڵەکان دەکەومە قسە ، بەڵام هــەر کە دەمەوێ تەلبەندەکە بە دەست لابدەم ئەوان لێم دووردەکەونــەوە • لەپێش چاومدا وایە وەك بتوێنەوە • تو خوا ئەمە چەند سەیرە ! بـە ڕۆژ هەمیشە خۆم ڕادەگرم ، نە ئاخ‌و نە هەناسە هەڵناکێشم ، کەچی شەو بەخەبەردێم دەبینم فرمێسك هەموو سەرینەکەمی تەڕکردوە •

دەنگی سەوڵلێدانی هاوڕێکەم هات لە دارستانەکەدا •

میوانە نەناسیاوەکەم کـە بەتەواوی لە دڵـم نزیـك بووبووەوە هەڵستایە سەر پێو دەستێکی گەورەی وەك تەختە ڕەقی بۆ درێـژ کردم :

ــ براله ! بەدوعا • خۆشیت دەخوازم •

ــ هیوامە تۆیش بە خۆشی بگەیتە کاشار •

ــ سوپاست دەکەم •• ڕۆڵە هۆو !•• وەرە با بڕۆین •

ڤانیا بە ڕاکردن هات بۆ لای باوکی • لای ڕاستیەوە وەستـاو دەستی بە پەراوێزی کورتەکە لبادەکەی بەریـەوە گرت • بەدوای هەنـگاوە گـەورەو پیـاوانەکانی بـاوکیدا قاچـە وردیـلانـەکانی هەڵدەهێنایەوە •

دوو مرۆڤی کەس بۆ نەماو •• دوو دانە لم زریانی شەڕ ئاوارەی ئەم شارو ئەو شاری کردوون •• ئاخۆ چی‌یان لە چارە نووسراوە ؟ بیرم کردەوە ، لە دڵی خۆمدا گوتم ئەم کابرا ڕووسـە کابرایـەکی بەورەیە •• کـێو پشتی ناچەمێنێتـەوە •• ئـەو منداڵەش زۆر بـاش پەروەردە دەکاو پێی دەگەیەنێ • ئەویش کە گەورە بوو دەتوانێ هەموو بارێك بگرێتە سەرشان •• ئەگەر نیشتمان هاواری لێ کرد ، هەر کۆسپێك بێتە ڕێی لای بدا •

بە خەفەتێکی قورسەوە بە چاو دوایـانکەوتم •• لەوانەبـوو

جویێ بوونەوەیان بەو شێوەیە دڵگیری نەکردمایە ، ئەگەر ڤانیا باش ئەوەی چەند هەنگاوێك دوور کەوتبـەوە ، ئاوڕی نەدایەتـەوەو ڕووی بۆ لای من وەرنەگێڕایەو ، دەستە خنجیلانە پەمەیی یـەکەی هەڵەتەکاندایە •• لەپڕ چنگێکی نەرم ، بەڵام نینـۆك درێـژو تیـژ دڵی گوشیم • لەناوا خێرا ڕووم وەرگێڕا • نەخەیر ! ئەو پیـاوە کامڵانەی شەڕ پیری کردوون و سەریانی سپی کردووە ، تەنیا لـە خەودا ناگرین ، لە بێداریشدا گەروویان پڕە لە قوڵپی گریان •• بەڵام گرنگ ئەوەیە بنیادەم لـەکاتی خۆیـدا ڕوو وەرچـەرخێنێ • لەوەش گرنگتر ئەوەیە دڵی منداڵ بریندار نەکا •• نەهێڵێ چـاوی لەوە بێ چۆن فرمێسکی گەرمی پیاوانە بە ڕوومەتیدا دێتە خوارێ •



وێنەکانی ناوەوەی کتێبەکە

**ئی · گۆدین**

و

**ئۆ · ڤێرێیسکی**

کردوویـانن

وێنەی سەربەرگەکەش

**س · ترۆفیمۆڤ**

کردوویـەتی

---

کتێبخانەی ( شانـۆ ) لە سلێمانی

بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەی گرتوەتە ئەستۆ

لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا

ژمارە ( ١٠٤٥ )ی ساڵی ١٩٨٠ی دراوەتێ

# МИХАИЛ ШОЛОХОВ

# СУДЬБА ЧЕЛОВЕКА

Перевод с русского на курдский язык

АБДУРАХМАНА МАРУФА

Под редакцией

**МУХАМЕДА МУЛЛЫ КЕРИМА**

Багдад 1980г.

---

نرخی ( ٣٠٠ ) فلسه


چاپخانەی الحوادث.

بەغدا ـ ١٩٨٠